فەرهاد شاکەلی

# زمانی کوردی
# لە ئاستانەی سەردەمێکی تازەدا

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران
مەڵبەندی کوردۆلۆجی

نووسینی: فەرهاد شاکەلی
ناوی کتێب: زمانی کوردی لە ئاستانەی سەردەمێکی تازەدا
پیتچنین: نووسەر
بەرگ: کەمال عەلی
چاپخانەی ڕەنج/ چاپی یەکەم/ سلێمانی
ژمارەی سپاردن: ١٧٨٥، ساڵی ٢٠٠٩
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٢٠٠٠ دینار
زنجیرە: ٤٥

مەڵبەندی کوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران ـ گەڕەک/ ١٠٥، کۆڵان/ ٢٥، ژ. خانوو/ ٤،
پۆست/ ٩٥
تەلەفۆن: ٣١٩٣٠٩٣
www.kurdology.com
kteb@kurdology.com

# پێڕست

# پێشەکی

بەشی زۆری بابەتەکانی ناو ئەم کتێبە لەگەڵ لایەنێکی زمانناسیدا خەریک دەبن کە پێی دەگوترێ (نەخشەبۆدانانی زمان: Language planning) یا (سیاسەتی زمانەوانی: Language policy)، کە تێکەڵاوییەکە لە بنەما زانستی و تیۆرییەکانی زمانناسی لەگەڵ بنەما و ڕێچکەکانی سیاسەت و ئیدیۆلۆگی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت. بە پێچەوانەی زۆر لایەنی تیۆریی زمانناسییەوە کە بنەماکانی تا ڕادەیەکی زۆر نەگۆڕن، نەخشەبۆدانانی زمان بەپێی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان و سەردەمە جیاوازەکان دەگۆڕێت. لەم ڕووەوە ئەزموونی کۆمەڵگە و نەتەوەکانی جیهان نەخشێکی گرنگیان لە گەشەپێدان و دەوڵەمەندکردن و قووڵکردنەوەی ئەم بابەتەدا هەیە.

لە کوردستانی ئەمڕۆدا گرنگی و پێویستیی نەخشەکێشیی زمان ئەرکێکی نیشتمانیی هێندە بەپەلەیە کە دەبێ بخرێتە پێش زۆر لەو کێشە سیاسییانەوە کە ڕەنگە سیاسەتمەداران بە گەرم و ژیارییان دابنێن. کێشەی زمان لە کوردستاندا، لە پاڵ کۆمەڵێ سەختی و ئاڵۆزکاویدا کە لە کۆنەوە لەگەڵیدا هاتوون و گەورە و گەورەتر بوونەتەوە و ئێستا بوونەتە بەشێک لە سروشتی کێشەکە، چەند ئاستەنگ و گرێیەکی دیکەی تێکەڵ بوون کە دەستکردی ئەم سەردەمەن. هەندێکیان ناحەزانی کورد دروستیان دەکەن، بەڵام بەشێکیشیان ئەوانەن کە پەیدابوون و سەرهەڵدانیان تاوانی کورد خۆیەتی.

ساڵانێکی دوور و درێژە من لەگەڵ کێشەی زماندا دەژیم و لێی دەکۆڵمەوە. ئەو لایەنانەی کێشەکە کە پێبەستی ڕێنووس و ڕێزمانن،

هەوڵم داوە لەبەر ڕووناکیی تیۆرییەکانی زمانناسیدا و بەپێی ئەزموونی تایبەتی خۆم لە بواری نووسین و وەرگێڕان و فێرکردندا چارەسەریان بۆ پێشنیاز بکەم. خۆشبەختانە لەو ڕووەوە کۆمەڵێ ئەنجام وەدەست هاتوون کە ڕەنگە بۆ بتەوکردنی زمانی کوردی کارکردی خۆیان هەبێت. لە بوارێکی دیکەدا، کە پێوەندیی بە زمانی ستاندارد و زمانی ڕەسمییەوە هەیە، بە دوو ڕێگادا بۆی ڕۆیشتووم، یەکەم: بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانم و ئەو ئەنجامگرییانەی بە هۆی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە پێیان گەیشتووم لە گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێب و لە دیداری ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆندا؛ دووەمیش: ڕووکردنە بڕیاربەدەستانی کوردستان بە هیوای ئەوەی لە کرۆکی کێشەکە بگەن و بتوانن بڕیاری ڕاست بدەن.
یەکێک لە کێشە گەورەکانی من، وەک نووسەرێک و زمانزانێک، لەگەڵ ڕۆژنامە و چاپەمەنیی کوردیدا کێشەی زمان و ڕێنووسە. گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان ئەو باسەیان زۆر بە سادەیی وەرگرتووە و لەوە نەگەیشتوون چ ئەرکێکی گەورە و خەتەرناکیان لەسەرە. سەرنجڕاکێش ئەوەیە لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی چاپەمەنییەکاندا، ژمارەی تاوانەکانیش بەرانبەر ڕێزمان، ڕێنووس، ئێستێتیکی وشە و شێواز، ڕەوانبێژی و هونەرکاری، بە کورتی بەرانبەر هەموو لایەنە جوان و بەرزەکانی زمانی کوردی، خێراتر دەچێتە سەرێ. دوو بابەتی ئەم کتێبە وەرامدانەوەی دوو حەفتەنامەیە.
بابەتی "زمان لە پەنجەرەی ئێستێتیکەوە" هەوڵدانێکە بۆ تەماشاکردنی وشەی کوردی لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە. پێشتریش لە وتاری "بە جامی ئەوینێک، گیان مەستە و تەن وێران"دا ئەم باسەم بە شێوەیەکی سەرەتایی ورووژاندبوو. لەم بوارەدا دەبێ کاری قووڵتر و زانستانەتر پێشکەش بکرێت. لە زمانی کوردیدا لەم ڕووووەوە شتێکی ئەوتۆمان نییە.
لە "زمانی پاشا و زمانی ڕەعییەت"دا هەندێ لایەنی سیمانتیکی و فۆنۆلۆگیی دیالێکتی سلێمانیی زمانی کوردیم لە چوارچێوەیەکی مێژووییدا خوێندووەتەوە. ئەو ماتەریاڵەی بە هاوکاریی نێوان ئەحمەد

پاشای بابان و خۆدزکۆی رۆژهەلاتناس بەرهەم هێناوە، سوودێکی زۆری هەبوو بۆ تێگەیشتن لە رەگورپیشەی ئەو بەشەی زمانی کوردی و شێوەی گەشەکردنی لە ماوەی سەدوپەنجا ساڵی رابوردوودا. لەو بوارەیشدا پێویستمان بە توێژینەوەی زیاتر و جیددیترە.

دەمەوێ لەم دەرفەتەدا سوپاسی هەموو ئەو دۆست و هاورێ و ئاشنایانە بکەم کە لە ئامادەکردن و بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەدا کۆمەکیان کردووم.

فەرهاد شاکەلی
سوێد، ستۆکهۆڵم، گەرەکی سۆللەنتوونا
بەرەبەیانی ٣٠-٨-٢٠٠٩

# زمانی پاشا و زمانی ڕەعیەت

## چەند سەرنجێکی زمانەوانی لەسەر زمانی کوردی (دیالێکتی سلێمانی) بەپێی زانیارییەکانی ئەحمەد پاشای بابان و خۆدزکۆ

وا پێ دەچێت زۆر دەمێک نییە خوێنەری کورد بەم وتارەی خۆدزکۆی زانیوە، دەنا دەبوو هەر زوو تەرجەمەی کوردی بکرایە، یان هەر نەبێ لە وتارێکدا لەسەر ناوەڕۆک و بایەخی شتێک بنووسرایە. من خۆم وا بزانم یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەیەکی مامۆستا مەسعوود محەمەدەوە (١٩١٩-٢٠٠٢) زانیم کە وتارێکی ئاوەها لەسەر زمانی کوردی نووسراوە.[١] هێندەیش من ئاگادار بم هەتا ئێستا نووسەری دیکەی کورد باسی نەکردووە. مامۆستا مەسعوود محەمەدیش، ئەگەرچی بە شێوەیەکی زۆر زانستییانە لە لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا (چەپکێک لە گوڵزاری نالی) سوودی لە زانیارییەکانی ناو وتارەکەی خۆدزکۆ وەرگرتووە، بەڵام باسی ئەوە ناکات ئەو وتارەی لە کوێ بەر چاو کەوتووە. مامۆستا بێجگە لەو زانیارییەی پێوەندی بە ژیانی نالییەوە هەیە، ئەوەیشی جەخت کردووە کە نالی کتێبێکی لەبارەی ڕێزمانی عەرەبییەوە هەبووە. ساڵانێک دواتریش لە کتێبەکەی د. ن. مەکنزیدا (Kurdish Dialect Studies) ئەو کورتە سەرنجەم بینی کە لەسەر ئەم وتارە نووسیویەتی.[٢]

لەم بیست و ئەوەندە ساڵەی ڕابوردوودا من کۆمەڵێ وتار و سەرچاوەی گرنگی زانستیم لەسەر زمانی کوردی و بابەتەکانی دیکەی

---

[1] محەمەد، مەسعوود: چەپکێک لە گوڵزاری نالی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری[ی] کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

[2] MacKenzie, D. N.: Kurdish Dialect Studies, Oxford University Press, London 1961.

سەر بە کوردەواری کۆکردوونەوە (فۆتۆکۆپیم کردوون)، کە ڕەنگە تێکڕای بگاتە سێهەزار لاپەڕەیەک. بابەتەکانی لای من لە پلەی یەکەمدا بە زمانی ئینگلیزین. بەڵام هەمیشە ئەوەم لە دڵدا بوو کە وتارەکەی خۆدزکۆیشم دەست بکەوتایە، ئەگەرچی من زمانی فرانسی ناخوێنمەوە. کە هەشت نۆ ساڵێک لەمەوبەر کاک نەجاتی عەبدوڵڵا هات بۆ پاریس بۆ خوێندن و پێوەندیی پێوە کردم، هەر زوو هەستم کرد ئەم پیاوە لە زۆربەی (ئەوانی دیکە) جیاوازە. لە هەلێکدا داوام لێ کرد وتارەکەی خۆدزکۆم بۆ کۆپی بکات و دواتریش دام بە گوێیدا کە هەوڵێ بدات بیکاتە کوردی. وتی دەیکەم، بە مەرجێ تۆیش لە ڕووی زمانەوانییەوە پێیدا بچیتەوە. هەر زوویش ڕێک کەوتین.

خۆشبەختانە کاک نەجات لەو لاوانەیە کە بواری زانستی و بواری تۆژینەوەی خوی دەناسێت و دەزانێ خۆی بە چییەوە خەریک بکات. ئەو بە ڕادەی یەکەم خۆی بۆ مێژوو، ئەویش مێژووی کوردستان، تەرخان کردووە. لەبەر ئەوە کە ئەو ئێستا هاتووە ئەم وتارەی کردووە بە کوردی، ئەرکێکی نائاسان و بگرە ناخۆشیشی خستووەتە ئەستۆی خوی. وەک ئەوەیە داوا لە من بکرێ وتارێک لەسەر کشتوکاڵی کوردستان بکەمە کوردی، کە نایکەم. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەنجامی کارەکەی هیی ئەوەیە کە پەسن بدرێت و بەرز بنرخێنرێت.

لێرەدا مەسەلە هەر ئەوە نییە تێکستێک لە فرانسییەوە بکرێتە کوردی. ئاڵۆزییەکە لە پێش هەموو شتێکدا لەوەوە دەست پێ دەکات کە بابەتی وتارەکە زمانەوانییە و پێویستی بە کۆمەڵێ تێرم (زاراوە) هەیە کە هێشتا لە زمانی کوردیدا جێگەی خۆیان نەگرتووە. لە سەردەمی ئەمڕۆدا هەموو زانستەکان زاراوەی خۆیان هەیە و کە تۆ زاراوەی زانستێکی تایبەتت نەزانی، نایشتوانی لەو بوارەدا قسە بکەیت و بنووسیت. کۆسپی دووەم ئەو تێکست و ڕستە و دەستەواژە کوردییانەن کە لە وتارەکەدا بە کار هاتوون و سەرلەبەریشیان کەسێک ئامادەی کردوون و نووسیونی، ئەگەرچی خوێندەوارە بەڵام، نە زمانەوانە و نە نووسەر، بەڵکە سیاسەتمەدار و دەستەڵاتدارێکی

سەردەمی خۆیەتی، مەبەستم ئەحمەد پاشای بابانە، کە ئاگادەر (Informant)ی خۆدزکۆی نووسەری وتارەکەیە.
ئەلیکساندەر خۆدزکۆ، بە پێچەوانەی پاشاوە، زمانەوانە (لینگویست یا فیلۆلۆگیست) و کۆمەڵێ زمانی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژاواییش دەزانێت. ئەو ئەگەرچی یەک وشەیە کوردیی نەزانیوە، بەڵام لەبەر ئەوەی شارەزای پێکهاتەی زمانە، بە تایبەتی زمانانی ئێرانی، توانیویەتی زانیارییەکانی پاشای کوردی بابان لە چوارچێوەی زانستی زمانەوانیدا جێ بکاتەوە و بنەمای زانستییان لێوە هەڵێنجێ. لەگەڵ ئەوەیشدا وەک زانایەکی ڕاستەقینە خۆنزمگرانە پێ لەوە دەنێ کە شارەزای کوردی نییە و کارەکەی ناتەواویی تێدایە و بۆ کەسانی لە خۆی زاناتری بە جێ دەهێڵێت.
بایەخی ئەم گوتارەی خۆدزکۆ هەر ئەوە نییە کە وێنەیەکی ئەو سەردەمەی دیالێکتێکی زمانی کوردیمان پێشان دەدات و لە ڕووی مێژووی زمان و ڕێزمانەوە کۆمەڵێ زانیاریمان دەداتێ کە بۆ تێگەیشتنی ئەمڕۆی زمانی کوردی گرنگن. ئەم لایەنەمان هەر بە خوێندنەوەی وتارەکە بۆ دەردەکەوێت. بەڵام ئەمە تاکە وتار نییە لەم بوارەدا، چونکە پێش ئەم، چەند ڕۆژهەلاتناسێکی دیکەیش لەسەر زمانی کوردییان نووسیوە، ئەگەرچی ئەوان لەسەر دیالێکتەکانی تریان نووسیوە، بە تایبەت دیالێکتەکانی کرمانجیی باکوور، و ئەم لەسەر بەشەدیالێکتی بابان (یا سلێمانی) کاری کردووە. بایەخی وتارەکە، لە پاڵ مێژووی ڕێزماندا، ئەوەیە کە بە هۆی تێکستەکانەوە، کە وا دیارە خۆدزکۆ هەمیشە پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کە ئەحمەد پاشا بە نووسین بیداتێ، کۆمەڵێ وشە و دەربڕینمان بۆ ماوەتەوە کە هەندێکیان ئەمڕۆ، لەو بەشە دیالێکتەدا، هەر نەماون. بێجگە لەمانەیش لێرە و لەوێی وتارەکەدا هەندێ زانیاریی لاوەکیمان دەست دەکەون کە بۆ مێژووی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەلایەتیی کوردستان، بەتایبەت کوردستانی خواروو، گرنگن. هەر بۆ نموونە دەبینین ئەو تۆزە زانیارییەی لەسەر (نالی)ی شاعیر چەندە کەڵکی هەبووە بۆ ئەو

لێکۆڵینەوە نایاب و دەگمەنەی کاتی خۆی مامۆستا مەسعوود محەمەد بڵاوی کردەوە.
خۆدزکۆ لە کات و سەردەمێکدا خەریکی ئامادەکردنی ئەم نووسینە بووە کە لە زۆر جێگەی دیکەی ئەورووپایش، زانایان و ڕۆژهەڵاتناسەکان هەوڵی ناسینی کورد و وڵاتەکەیان و زمانەکەیانیان داوە. خۆیشی لە پێشەکییەکەیدا ئەمە باس دەکات. دیارە ئەو کاتە ڕۆژهەڵاتناسەکانی ڕووسیا زۆر چالاک بوون و بە هۆی نزیکییەوە لە دەوڵەتی عوسمانییەوە دەرفەتی باشیان هەبووە لەسەر کورد لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن. هاندەری ئەو کارەیشیان هەر تەنیا خواستی زانستی یا کورددۆستی نەبووە، بەڵکە بەرژەوەندییە سیاسی و عەسکەری و ئابوورییەکانی ئیمپراتۆرییەتی قەیسەریی ڕووسیایش ئەوەی پێویست بووە. ڕۆژهەڵاتناسانی ڕۆژاوایش هەر زوو کەوتنە خۆیان و چوونە ناوچەکانی کوردستان و دەستیان بە لێکۆڵینەوە کرد. ئەمانیش نوێنەری نارەسمیی بەرژەوەندیی کۆلۆنیالیستانەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژاوا بوون. هاوکات لەگەڵ ئەمان و پێش ئەمانیش میسیۆنێرەکان لە کوردستان بوون و لە پاڵ کاری بە ناو (زانستیدا) خەریکی بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحییەت بوون و ڕێگەیشیان بۆ کۆلۆنیالیستەکان خۆش دەکرد. من بەرهەمی دیکەی خۆدزکۆم بەرچاو نەکەوتووە، بەڵام بەپێی قسەکانی پێشەکیی ئەم وتارە وا هەست دەکەم تا ڕادەیەک کوردی خۆش ویستبێت و هەوڵی دابێت بەرگرییەک لە زمانی کوردی بکات. لەناو ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەکاندا جاروبار وا هەڵکەوتووە کە کەسێکیان بڕێک هاودەردیی لە گەڵ کورددا هەبووە و شێوەی هەستێکی بەزەییئامێزی لا دروست بووە و دوو قسەی چاکیشی کردووە کە بە کەڵکی کورد بێت. ئەم هاودەردییە و ئەم هەڵوێستی جاروبار دۆستایەتییە هەرگیز ئەو ڕاستییە ناشێرێتەوە کە ئەوان بەشێک بوونە لە هەڵمەتی داگیرکارانەی کۆلۆنیالیستان (و دواتر ئیمپەریالیستان) و بە کارە زانستییەکانیان ڕێگەی ناسینی ڕۆژهەڵاتیان بۆ دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری و عەسکەریی ڕۆژاوا خۆش کردووە.

# چەند تێبینییەک
# لەسەر تێکستە کوردییەکە و بنەما ڕێزمانییەکان

یەک: ڕێزمان (و فۆنۆلۆگی)

<> لەمێ: ئاوەڵکارێکە بە مەعنای (لێرە) بە کار هێنراوە. کە ئێمە بیر لەوە بکەینەوە (لەوێ) واتە (لە ئەو جێگەیە)، کەواتە (لەمێ) یش واتە (لە ئەم جێگەیە). من وای بۆ دەچم (ێ)ی هەردوو وشەکە شێوەی سواو یا کورتکراوەی (جێ) بێت.، واتە (لە ئەو جێ) سوابێت و بووبێتە (لە ئەوێ: لەوێ)، هەروەهایش (لە ئەم جێ: لە ئەمێ: لەمێ). شایانی باسکردنە کە لە هەندێ بەشی ناوچەی گەرمیان ئێستاکەیش زۆر بە ئاسایی (لەمێ) لە باتیی (لێرە) بە کار دەبرێت. دیارە لە سەردەمی دەستەڵاتی بابانەکاندا (لەمێ) بە کار هێنراوە. شاعیری گەورەی کورد (نالی)، کە خۆی هاودەمی ئەحمەد پاشای بابان بووە، وشەکەی لە شیعرێکدا بە کار بردووە، کە دەڵێ:

بە کوێری دوور لە (نووری) مایەوە (نالی) لەمێ، یا ڕەب!

فویووضی تۆزی ڕێگەی کوحلی چاوی ئەشکباری بێ[٣]

بەڵام شاعیری گەورەی کورد (مەحوی)یش، کە نزیکەی سی ساڵ دوای نالی لە دایک بووە و لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کۆچی کردووە، ئەویش وشەکەی بە کار هێناوە و لە شیعرێکدا دەڵێ:

وەکوو ڕۆژ ئەو مەهە لەو دوورە دەرکەوت

لەمێوە ئەشک و ئاهی ئێمە سەرکەوت[٤]

---

[3] مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عبد الکریم: دیوانی نالی، لە **چاپکراوەکانی** کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل٦٣٧.

[4] مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عبد الکریم: دیوانی مەحوی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا ١٩٧٧، ل:٨٧.

<> كن: بە مەعنای (لا) یا (تەنیشت، نزیک). لە زۆر ناوچەی کوردستاندا بە کار دەبریت بەلام لە سلیمانی، کەرکووک و گەرمیان نەماوە. لە کرمانجیی ژووروودا بە شیوەی (نک) دەگوتریت و لە گەڵ وشەی دیکەی وەک (جەم، ڕەخ، دەڤ) هاوواتایە. دەبێ لە سەردەمی بابانەکاندا و تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش بەکارهێنانی لەو ناوچانەیشدا ئاسایی بووبێت. (نالی) دەڵێ:

لە کن تۆ خار و خەس گوڵزارە بێ من
لە کن من خەرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ[٥]

مەحوی دەڵێ :

کە من دڵ پڕ کەدەرم و لێڵە عەیشم
لە کن من بەس بکەن باسی وەفا، بەس[٦]

شێخ ڕەزای تاڵەبانی (ی کەرکووکی) دەڵێ:

تف لە کوز دایکی لەلای خۆی کوڕی هێناوەتە دەر
گوو بە ڕیش بابی لە کن خۆی ئەمیش ئەولادی هەیە

هەر لەو قەسیدەیەدا دەڵێ:

من لە کەرکووکەوە دێنێتە کن ئەم قەحپەژنە
لە گەڵم خەسمە فەلەک نییەتی بێدادی هەیە[٧]

---

[5]مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عبد الكريم: دیوانی نالی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا ١٩٧٦، ل ٣٨٢.

[6]مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عبد الكريم: دیوانی مەحوی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا ١٩٧٧، ل: ١٤٦، هەروەها لاپەڕەکانی ٢٢٣، ١٥٢، ١٢٥.

[7]مستەفا، شوکور: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٠، لاپەڕە.٩٧، ٩٨. بەلام لێرەدا دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکەین کە شێخ ڕەزا وشەکەی وەک جۆرە ڕەوانبێژییەک (Rhetoric) بە کار بردووە، چونکە=

<> لە....دە: ئەحمەد پاشا لە قسەکانیدا لە دوای پریپۆزیسیۆنی (لە)وە، پۆستپۆزیسیۆنی (دە)ی بە کار هێناوە. خۆدزکۆیش ئەوە جەخت دەکات کە پۆستپۆزیسیۆنی (دە) بە دوای (لە)دا دێت. باوەڕ ناکەم مەسەلەکە ئەوە بێت پاشا وشەکەی خراپ گۆ کردبێت، چونکە لە هەموو جێگەیەکدا ئەمە دووبارە دەبێتەوە و هەروەها ئەوەیش دەزانین کە پاشا زۆربەی ڕستەکانی بە نووسینیش داوە بە خۆدزکۆ. لە کوردیی ئەمڕۆدا پۆستپۆزیسیۆنی (دا) جێگەی (دە)ی گرتووەتەوە. سەرنجڕاکێش ئەوەیە ئەم بارە لە کوردیی ژووروودا ڕێک بە پێچەوانەوە ڕووی داوە. لە تێکستە کلاسیکییەکانی کرمانجیدا (مەلای جەزیری، خانی) پۆستپۆزیسیۆنی (دا) بە کار هێنراوە. لە ڕۆژنامەکانی (کوردستان ١٨٩٨) و (ژین ١٩١٨-١٩١٩)یشدا دیسان بە زۆری هەر (دا) دەنووسرێت، کەچی لە دەرچوونی مانگنامەی (هاوار، ١٩٣٢)ەوە لە کرمانجیدا تا ڕادەیەکی زۆر (دە) جێگەی (دا)ی گرتۆتەوە. کوردیزانانی کوردستانی موکریان زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەو پریپۆزیسیۆنەی بۆ دۆخی لۆکاتیڤ [Locative] بە کار دەبرێت (دە)یە نەک (لە)، بەڵام لە سلێمانی (هەروەهایش بەشی زۆری کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵات) پۆستپۆزیسیۆنی (لە) بە کار دەبرێت. لە کرمانجیی سەروودا (د: di) دەگوترێت و دەنووسرێت.

<> یەک: ڕاناوی هەردوولایی(Reciprocal pronoun) ، لە زمانی ئەمڕۆدا زیاتر بە شێوەی (یەکتر، یەکتری، یەکدی) بە کار دەبرێت، ئەگەرچی لە هەندێ ناوچە (بۆ نموونە گەرمیان) هێشتایش (یەک) لە کاردایە؛ (تۆ منت خۆشدەوێ، منیش تۆم خۆش دەوێ ، ئێمە یەکمان/ یەکترمان/ یەکتریمان/ یەکدیمان خۆش دەوێ). ئەحمەد پاشا (یەک)ی بە کار بردووە (یەک بە یەک دەڕێن و یەک بانگ دەکەن).

<> دۆخی (ئۆبلیک): لە کۆمەڵێک زماندا هەبوونی دۆخی ئۆبلیک [چەماوە] (کاسووسی ئۆبلیک) دیاردەیەکی ئاساییە. لە ئەمڕۆی زمانی

---

=ئەو باسی (مام غەفوور)ی دەکات و مامیشی (کۆیی) بووە و لە کۆیە، ئەوسایش و ئێستایش، بەکارهێنانی ئاساییە.

کوردیدا دۆخی ئۆبلیک لە بەشی کرمانجیی سەروودا بە تەواوی پێڕۆ دەکرێت. هەبوونی ئۆبلیک لە کرمانجیدا بە یەکگرتنی دوو هۆ دروست دەبێت: گێنوس و دۆخەکانی ناکارا. لە ڕاستیدا لە کرمانجیدا ناو (Substantive)لە دوو دۆخی کارا و بانگکردن (Vocative) بەولاوە، هەموو دۆخەکانی دیکە بە ئۆبلیک دادەنرێت. من لە ئەنجامی کارکردنێکی چڕوپڕدا لەسەر کرمانجیی باکوور، گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی دۆخی ئۆبلیک لە کرمانجیی باکووریشدا تا ڕادەیەک لاواز بووە، بەڵام ئەمە تەنیا زایەندی نێر (Masculine) دەگرێتەوە، دەنا کە ناوی مێ (Feminine)دەبێتە بەرکاری ڕاستەوخۆ، ناڕاستەوخۆ یا ئیزافە، دیسان هەر بە شێوەی ئۆبلیک گەردان دەکرێت. وا دیارە دۆخی ئۆبلیک لە دیالێکتەکانی خوارووی زمانی کوردییشدا لە سەردەمێکدا هەبووبێت، بەڵام لە ماوەی سەد ساڵی ڕابوردوودا وردە وردە ون بووە. ئەم لەناوچوونەی دۆخی ئۆبلیک ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی لەناوچوونی، یا کزبوونی ڕۆڵی، گێنوسە لە کوردیی خوارووا. لە بەشەدیالێکتی موکریانیدا شوێنەوارێکی کەمی ئۆبلیک ماوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆڵی گێنوس لەوێیش نەماوە، بەکارهێنانی ئەو دۆخە بەپێی بنەمایەکی ڕێکوپێکی زمانەوانی بە کار ناهێنرێت. مامۆستا هێمن (١٩٨٦-١٩٢١) پێی وا بوو ئەو شێوە بەکارهێنانە دەبێ بە تەواوی وازی لێ بهێنرێت.

لە تێکستەکانی خۆدزکۆدا دۆخی ئۆبلیک بە شێوەیەکی سیستەماتیک دەردەکەوێت. ئەمە ئەوە پیشان دەدات لەو سەردەمەدا دۆخی ئۆبلیک هەبووە، چونکە ئەحمەد پاشا لە هەموو قسە و ڕستەکانیدا پێڕۆیی کردووە. لەم ڕووەوە من دوو سەرنجم لا دروست بوون: <یەک>: ئۆبلیک لە قسەکانی پاشادا هیچ پێوەندییەکی بە زایەند (گێنوس)ەوە نییە. <دوو>: دۆخی ئۆبلیک هەر دۆخی بەرکاری ڕاستەوخۆ (Accusative)یە، نەک دۆخەکانی دیکەی وەک بەرکاری ناڕاستەوخۆ (Dative) یا (Ablative) و (Genitive). خۆدزکۆ لە ڕوونکردنەوەی ئەم باسەدا تەنیا بەوە خۆی پەڕاندووەتەوە کە (دۆخی بەرکارێتی

acusatif لە ڕێگەی (ی) کۆتایی دروست دەبێ..) (بنەمای ٩ لە بەشی- ناو). ئەم باسە هەڵدەگرێ قسەی زۆرتری لەسەر بکرێت.

<> پاشگر (سوفیکس)ی (-ەوە): خۆدزکۆ لە کاتی گەردانکردنی هەندێ کرداردا لەوە سەری سووڕ ماوە کە دەبێ (کردەوە، بکەوە، دەکەیەوە) لە کوێوە هاتبێتن و بنەمای دروستبوونیان چی بێت. ڕاستییەکەی ئەم پاشگرە ڕۆلێکی یەکجار گرنگ و گەورەی بینیوە و دەبینێ بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی. بەشێک لە کردار و ناوە کوردییەکان بە پێوەلکاندنی پاشگری (-ەوە) واتایەکی تازە وەردەگرن. تەنانەت ئەمڕۆیش ئێمە دەتوانین بۆ دروستکردنی وشە و چەمکی تازە سوود لەم پاشگرە وەربگرین.

<> پێشگری دە (ئە)ی کردار: هێندەی من ئاگادار بم لە هەموو زمانی کوردیدا تەنیا شێوەی قسەکردنی ناوچەکانی سلێمانی، گەرمیان و سنە و ئاخێوەرانی بەشە دیالێکتی (فەیلی)ن کە لە بنەمای بەکارهێنانی (دە) لایان داوە، دەنا هەموو زاراواکانی دیکەی کوردی پێشگری کرداری (دە، د، ت) بە کار دەبەن. مامۆستا تۆفیق وەهبی (١٨٩٤-١٩٨٤) بەم پێشگرە دەڵێ (پیتەقالبی)، د. ن. مەکنزی پێی دەڵێ(Modal affixes) ، یان هەر تەنیا پێشگر (Prefix) .

لە بەشەدیالێکتی سلێمانیدا ئەم بەکارهێنانی (ئە) یە دیاردەیەکی تازەیە و پێم وایە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا پەیدا بووە، چونکە شاعیر و نووسەرانی کلاسیکی سەدەی نۆزدەیەم هەموو (دە)یان بە کار هێناوە. تۆفیق وەهبی دەڵێ لەبەر ئەوەی سەعید صدقی لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەمدا چووەتە بەر خوێندن لە مزگەوتەکانی سلێمانیدا، تەنانەت لەو ڕێزمانەیشدا کە ساڵی (١٩٢٨) بڵاوی کردووەتەوە هەمیشە (دە)ی بە کار هانیوە و دەبێ (ئە)ی بە گۆڕینێکی عامی زانیبێ.[8] نالی، سالم و مەحوی لە شیعرەکانیاندا (دە)یان بە کار بردووە. مەولانا خالیدی شارەزووریی نەقشبەندی (١٧٧٩-١٨٢٧) لە عەقیدەنامەکەی خۆیدا

---

[8] وەهبی، تۆفیق: ئەسڵی پیتەقالبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل:٣٤-٩.

(دە)ی بە کار هێناوە.[9] هەروەهایش شێخ حوسەینی قازی (١٨٦٨-١٧٩٠). مامۆستا وەهبی پێی وایە (ئە) لەژێر تاوی بەشەدیالێکتی ئەردەڵان و جافیی شارەزووریدا هاتووەتە ناو زمانی قسەکردنی شاری سلێمانییەوە. لە زمانی ئەدەبیی ستانداردی کوردیدا لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەمەوە (دە) وەک پێشگری کردار، بۆ بنیاتنانی کرداری ڕانەبوردووی سادەی ئاگادەر و ڕابوردووی نارەبەق (بەپێی دەربڕینی مامۆستا وەهبی!) جێگەی گرتووە و تا ڕادەیەکی باش چەسپیوە و بەنزیکەوە هەموو نووسەرانی کورد بە کاری دەهێنن. بەڵام لە زمانی ڕۆژانەی قسەکردندا دیارە خەڵکی گەرمیان (بە کەرکووکیشەوە) و سلێمانی و ئەردەڵان هێشتا هەر (ئە) دەڵێن.

<> ئەز: ڕاناوی کەسی یەکەمی تاک لە دۆخی کاراییدا هەندێ جار (ئەز) بە کار هێنراوە. لەم بارەیەوە پێشتریش شت نووسراوە. ڕەگوڕیشەی (ئەز) لە زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکاندا زۆر کۆنە. لە فارسیی کۆندا، فارسی باستانی (Old Persian) بە شێوەی (ئەدەم) و لە ئاڤێستادا بە شێوەی (ئەزم) هاتووە. لە فۆلکلۆری کوردیدا پەندێک هەیە دەڵێ (ئەگەر زانیت ئەزم، ئەگەر نەتزانی دزم). (ئەز) لە چەند شیعری نالیدا هەیە.

لە کرمانجیی سەروودا بنەماکانی بەکارهێنانی (ئەز و من) زۆر ڕێکوپێکن و جێی خۆیان گرتووە. هەندێ لە نووسەرانی کوردی باشوور و ڕۆژهەڵات لەم ساڵانەی دواییدا دەیانەوێ (ئەز) بخەنە ناو نووسینەکانیانەوە. بەڵام زۆر بە شێوەیەکی هەڵە و نەزانانە ئەم کارە دەکەن. بنەمای ڕێزمانیی ئەم دوو ڕاناوە دەکرێ بەم جۆرە کورت بکرێتەوە: کرداری ڕانەبوردوو، تێپەڕ بێت یا تێنەپەڕ، ڕاناوی بکەری (ئەز) دەبێت: ئەز دەنووسم، دەڵێم، دەبینم= ئەز دەچم، دێم، دەخەوم... بۆ کردارەکانی ڕێژەی ڕابوردوو، تەنیا کرداری تێنەپەڕ (ئەز)

---

[9] مەلا کەریم، محەمەد: عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەرگی هەشتەم، ١٩٨١، ل: ٢٢٢-١٩٩.

وەردەگریت: ئەز هاتم، چووم، ڕاوەستام، خەوتم...هتد، بەڵام: من نووسیم (نڤیسی)، وتم (گۆت)، خواردم (خوار)، پرسیم (پرسی)...هتد. هەروەها کاتێ ڕاناوی کەسی یەکەمی تاک لە دۆخی (ئۆبلیک)دا دێت، دەبێ (من) بێت نەک (ئەز): ماڵی من، براکەی من، بۆ من، لە منەوە، لە مندا، ئەو من دەناسێت...هتد. مامۆستا تۆفیق وەهبی پێی وایە لە دەستدانی (ئەز) لە کوردیی خوارووودا هەڵەیەکی گەورە بووە و لەژێر کارکردی ئەردەڵانی-جافیدا ڕووی داوە.(ئەمە غەڵەتێکی گەورە بوو لە چاو سرشتی ئەسڵی زمانی کوردیدا. دیارە زمانەکەمان دەمێکی زۆر نییە کە (ئەز)ی فەرامۆش کردووە. میستەر ڕیچ لە ساڵی ١٨٢٠ دا لە سلێمانی گۆرانییێکی بیستووە کە تێیدا ڕستەی- ئەز دەناڵم- هەبووە).[10]

<> ڵ > ر: یەکێک لە نیشانە هەرە دیار و جیاوازیدانەرەکانی نێوان بەشەدیالێکتەکانی ناوچەی سۆران و بابان، لە ڕووی فۆنەتیکییەوە، ڕەنگە ئەو دوو فۆنێمەی ڵ= ر بێت. بەشێکی زۆری ئەو وشانەی لە ناوچەی بابان فۆنێمی (ڵ)یان تێدایە، لە سۆران (ڵ) ەکە بە (ر) بێژ دەکرێت.

لە تێکستەکانی ئەحمەد پاشای باباندا، ئەم فۆنێمە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش بەپێی فۆنەتیکی ناوچەی سۆران بێژ کراوە، واتە زۆربەی ئەو وشانەی ئەمڕۆ لەسلێمانی و گەرمیان و موکریان و بەشەدیالێکتەکانی کوردیی نێوەڕاست (بێجگە لە سۆران) فۆنێمی (ڵ)یان تێدایە، ئەو بە شێوەی (ر) بێژی کردوون: بلێ: برێ، خەڵووز: خەرووز، ئەمساڵ: ئەمسار، هەڵامەت: هەرامەت، کوتاڵ: کوتار، پەشتەماڵ: پەشتەمار، لەگەڵ: لەگەر، ساڵێک: سارەک، ماڵەوە: مارەوە، حاڵ: حار، حاسڵ: حاسر. ڕاستییەکەی ئەگەر ئەمە تەنیا یەک دوو جار ڕووی بدایە، وامان دادەنا کە خۆدزکۆ لە گواستنەوەدا هەڵەی کردبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە بەشی هەرە زۆری تێکستەکەدا ئەمە دووبارە و

---

[10] وەهبی، تۆفیق: ئەسڵی پیتەقاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل:٣٤-٩.

چەند بارە دەبێتەوە، دەگەینە ئەو باوەڕەی کە پاشا هەر وا قسەی کردووە. بەڵام پرسیارێکی گرنگ ئەمەیە: ئایا ئەمە جیاوازیی نێوان زمانی پاشا و ڕەعییەتە؟ ئایا خەڵکی شارەکەیش ئەو کاتە هەر وا قسەیان کرووە، یا ئەمە تەنیا شێوەی ئاخاوتنی پاشایە؟ من خۆم گوێم لێ بووە کەسێکی سەر بە بنەماڵەی بابان (نەوەی ئەمڕۆ) کە قسەی کردووە هەندێ جار ئەو فۆنێمی (ڵ)-ەی گۆڕیوە و کردوویەتی بە (ر). ئەگەر باشم لە بیر مابێت، بەتایبەت بۆ (لەگەڵ) دەیگوت (لەگەر). مەکەنزی لە کتێبەکەی خۆیدا سەرنجێکی لەم بارەیەوە نووسیوە، دەڵێ: ئەوەی کە (پاشا) زۆر جار، بەڵام هەمیشە نا، (ڵ) وەک (ر) بێژ دەکات، دەکرێ وا لێک بدرێتەوە کە تایبەتێتییەکی ئەریستۆکراتییانەیە. یان شێوەیەکی ناسلێمانییانەیە، کە زەحمەتە شێوەیەکی کۆنی زاراوەکە بێت.[11]

<>د > ت: لە دوو جێگەدا دەنگی (د) گۆڕاوە و کراوە بە (ت): کرد (کرت)، نامەرد (نامەرت). لەوەیە ئەمە هەر هەڵەیەکی ئاسایی بێت کە پاشا لە کاتی نووسیندا کردبێتی، یا خۆدزکۆ بەهەڵە گواستوویەتییەوە.
<> بەشێک لەو بنەما ڕێزمانییانەی خۆدزکۆ لە وتارەکەیدا پێشکەشی کردوون، لەگەڵ ڕاستییەکانی زمانی کوردیدا ناگونجێن. ڕەنگە ئێمە بتوانین لەم لایەنە بگەین و وای پاساو بدەین کە کابرا زمانەکەی نەزانیوە و کارەکەی لە جێگەی قسەپێکردنی زمانەکە، کوردستان، ئەنجام نەداوە. بەڵام هەندێ لە ئەنجامگرییەکانیشی هێندە نازانستییانەن کە بۆ کەسێکی شارەزای زمانەوانی ناکرێ بکەوێتە هەڵەی لەو جۆرەوە (نوختەی ١٦ و ٢٣ و ٣٥ی بەشی ناو). هەڵەیەکی زۆر ئاشکرای خۆدزکۆ بەکارهێنانی، یا تێکەڵکردنی، تێرمە ڕێزمانییەکانە. ئەو لە گەلێ جێگەی وتارەکەیدا کە دێت کرداری فەرمان/ ئەمر (Imperative) باس دەکات، نموونەکانی هیی فەرمان نین، بەڵکو هیی ڕانەبردووی خوازیارین(Present subjunctive) ، کە مامۆستا

---

[11] MacKenzie: op. Cit. P. xix

وەهبی ناوی دەنێ (موزاریعی پەیڕەوی). ئەم دوو ڕێژەیەی کردار دوو شتی جیاوازن. باوەڕ ناکەم خۆدزکۆ نەیتوانیبێت پاشا حاڵی بکات، بە تورکی و بە فارسی، و لێی بپرسێت کە کورد ئەم کردارە چۆن دەڵێن و چۆنی بە کار دەهێنن. هەروەک دەبێ پاشایش توانیبێتی بە ئاسانی بۆی ڕوون بکاتەوە. هەڵەکردن بە تایبەت لەم نوختەیەدا سەیر دێتە پێش چاو، لەبەر هۆیەکی ئاسان؛ ڕێژەکانی دیکەی کردار دەکرێ بۆ شەش کەس گەردان بکرێن، بەڵام فەرمان تەنیا بۆ دوو کەس گەردان دەکرێت: کەسی دووەمی تاک و کەسی دووەمی کۆ.

## دوو: وشە و دەستەواژە

<> بیدمشک: ئەحمەد پاشا لە جێگەیەکدا باسی خواردنەوەی شەربەتی (بیدمشک) دەکات، کە وا پێ دەچێت ئەو سەردەمە خواردنەوەیەکی باو بووبێت و لە کەبابخانە و چێشتخانەکان لەگەڵ نان و خۆراکدا دانرابێت. دیارە وشەکە بەو شێوەیەی پاشا نووسیویەتی فارسییە. فارس پێی دەڵێ (بیدمێشک =بیدمشک). گیوی موکریانی پێی دەڵێ (بێ مشک> بیرمشک) و وای لێک دەداتەوە: دارێکە وەک دارەبی دەچێ، ئارەقی گوڵە بۆنخۆشەکانی دەگیرێ وە لەویش شەربەتی دروست دەکەن.[١٢] مامۆستا هەژاریش پێی دەڵێ (بیمیشک) و لە ڕوونکردنەوەدا دەڵێ: جۆرێ بییە گوڵی سپی و بۆنخۆش دەکا.[١٣]

<> جموشگەهـ: پاشا ئەم وشەیەی بەرانبەر (جمگە یا جومگە)ی ئەمڕۆی کوردی بە کار بردووە. شایانی سەرنجدانە کە وا پێ دەچێ لە (جنبشگە یا جنبشگاە)ی فارسییەوە هاتبێت و ئەم هەموو گۆڕانەی

---

[12] موکریانی، گیو: کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ١٩٩٩.

[13] هەژار: هەنبانەبۆرینە، فرهنگ کردی-فارسی، سروش، تهران ١٣٦٩.

بەسەردا هاتبێت، ئەگەرچی لە فارسیی ئەمڕۆدا وشەیەکی وەها هەر نییە. (جنبشگە) واتە جێگەی سووڕانەوە و بزووتن. دیارە جمگە یا جومگەیش ئەو جێگەیەیە کە دوو ئێسک (ئێسقان) بە یەک دەگەن و بە هۆی پارچەیەک کرتێنکەوە کە دەکەوێتە نێوانیان دەتوانن بسووڕێنەوە و ببزوون.

<> دیوانخانە: شێوەی باوی لە کوردیی ئەمڕۆدا (دیوەخان)ە. شێوەی دیکەیشی هەیە وەک (دیوان، دیواخان، دیواخانە، دیوەخانە).

<> گزنگ: بەڕاستی من پێم وا بوو ئەم وشەیە لە زمانی کوردیدا نوێیە و ڕەنگە ئەم چل پەنجا ساڵەی دوایی پەیدا بووبێت.

<> داخستن: بە مەعنای پانکردنەوە، بڵاوکردنەوە و دانانی شتێک لەسەر زەوی (سفرە، حەسیر، دۆشەک، قاڵی و هتد). ئەمڕۆ زیاتر دەگوترێ (ڕاخستن). لە ناوچەی گەرمیان تا سی ساڵ لەمەوبەر هەر دەگوترا (داخستن) نەک (ڕاخستن). نازانم ئێستایش وا دەڵێن یا نە. پێشگری (دا) کە یەکێکە لەو پێشگرانەی بە هاوکاریی کردارێکی سادە، کرداری لێکدراو(Compound verb) دروست دەکات، بە ڕادەی یەکەم بزووتنەوەیەک دەگەیێنێ لە سەرەوە بۆ خوارەوە، لە بەرزییەوە بۆ نزمی.

<> چشت: لە کوردیی ئەمڕۆدا بە زۆری دەگوترێ (شت). هەر ئەم شێوەیەیش بۆتە بەشێک لە تێرمی (شتومەک) کە لە ناوچەی سۆران کورت کراوەتەوە و بووەتە (شمەک). لە ناوچەی گەرمیان جاران دەگوترا (چت). لە بادینانی و کرمانجیدا دەگوترێ (تشت).

<> یەملک (یەملیک): وشەیەکی تورکییە بە مەعنای (نان، خۆراک، خواردن، خواردەمەنی، شێو، شیو، چێشت).

<> سفرە، بریانی، پڵاو: کۆمەڵە تێرمێکی گرنگن لە بواری نانخواردن و میوانداری و کەیف و ڕابواردن و سەیراندا.

<> چاوەش (یا چاووش): شمشێربەدەست، پاسەوان، نامەبەر، مۆسیقاژەنی کۆشکی پاشا. لەم تێکستەدا هەر لە باتیی خزمەتکار بە کار هاتووە.

<> کیلەرچی (وشەیەکی تورکیی عوسمانییە): کیلەر یا کیلار، ئەنبار، عەمار یا عەمبار: جێی هەڵگرتن و پاراستنی خواردەمەنی و ئازووخە. کیلەرچی: خزمەتکار، نۆکەر، بەڵام زیاتر بۆ سەرۆکی خزمەتکارانی کۆشک دەگوترێ، بەتایبەت ئەوەی کە بەرپرسی ئامادەکردنی خوان و خواردنەوەیە.

<> دراو: وا باوە کە دەبێ لە (دراخما)ی یۆنانییەوە، و لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە، هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە (دراخما: درهەم: درەم: دراو یا دراڤ). وشەی درهەم لە قورئانی پیرۆزدا هەیە: (وشروه بثمن بخس دراهم معدودة وكانوا فيه من الزاهدين) سوورەتی یووسوف، ئایەتی بیستەم.

<> مانهەڵگرتن: لە کوردیی ئەمڕۆییدا دەڵێین (مانگرتن) و ئەمەیش چەمکێکی زیاتر سیاسیی هەیە کە بەرانبەر (اضراب)ی عەرەبی و (Strike)ی ئەوروپایی بە کار دەهێنرێت. وا پێ دەچێت لە سەردەمی بابانەکاندا وترابێ (مانهەڵگرتن)، کە دەکرێ لەگەڵ (ڕقهەڵگرتن) بەراورد بکرێت. لە ناوچەی گەرمیان کاتی خۆی وشەکە تەنیا بۆ ئاژەڵ دەگوترا نەک بۆ مرۆڤ؛ بۆ نموونە دەیانگوت: ئەو وڵاخە مانی گرتووە. ئاوەڵواتایەکی (مانگرتن) هەر لە گەرمیان (سینکردن) بوو، دەگوترا: وڵاخەکە سینی کردووە. لەم تێکستەی ئەحمەد پاشایشدا وشەکە لە باسی بەرازدا بە کار هاتووە.

<> وشەی سەیر: لە تێکستەکەی خۆدزکۆدا (کە لە ڕاستیدا قسە و نووسینی ئەحمەد پاشای بابانە) هەندێ وشەی سەیر و واتانەدار هەن کە نازانم لە کوێوە هاتوون و لە ڕووی ئێتیمۆلۆگییەوە ڕەگوڕیشەیان دەگاتە کوێ. دوور نییە خۆدزکۆ لە نووسینەوە و گواستنەوەی تێکستەکەدا هەڵەی کردبێت، چونکە دەیان هەڵەی دیکەیش هەن. پاشا لە جێی (ئاسک) دەڵێ (ڕەنی) کە، هێندەی من ئاگادار بم، خزمایەتیی لەگەڵ هیچ زمانێکدا نییە. د. ن. مەکنزی- یش هەر ئەم وشەیەی پێ سەیر بووە. وشەیەکی سەیری دیکە (داغبێ)یە کە مەبەست، بە قسەی پاشا و خۆدزکۆ، چۆلەکەیە. من بە دووری نازانم ئەحمەد پاشا (دەعبا)ی وتبێ (یا نووسیبێ) و خۆدزکۆ بە هەڵە تۆماری کردبێت.

## سێ: هەندێ زانیاریی لاوەکی، بەڵام گرنگ

<> مامۆستا مەسعوود محەمەد لە لێکۆڵینەوەکەی خۆیدا لەسەر نالی، وای بۆ دەچێت کە ئەحمەد خان (یا پاشا) تەنیا ساڵی ١٨٥٣ لە پاریس بووبێت.[١٤] ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خۆدزکۆ دەڵێ لەو ساڵەدا هاتۆتە پاریس، بەڵام لە جێگەیەکی دیکەی هەر ئەو وتارەدا بە ڕوونی ئەوە دەڵێ کە هەتا کۆتاییی مانگەکانی ساڵی ١٨٥٤ پێکەوە کاریان لەسەر ڕێزمانی کوردی کردووە. دواتر باسی ئەوە دەکات کە پاشا بانگ کراوەتەوە بۆ ئەستەمووڵ. کەواتە پاشا بە لای کەمەوە تا کۆتاییی ساڵی ١٨٥٤ لە پاریس بووە و ئەگەر زۆریش بە پەلە چووبێتەوە بۆ ئەستەمووڵ، ئەوا دەبێ لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٥ دا گەڕابێتەوە. بۆ پیاوێکی وەکوو پاشا کە زۆریش نەخۆش بووە، ئەقڵگیر نییە هەر وا بە پەلە ملی ڕێ بگرێت و پاریس بە جێ بهێڵێت. ئەم زانیارییە دەبێتە پاڵپشتێکی گەورەتر بۆ تیۆرییەکەی مامۆستا مەسعوود کە نالی لە ١٨٥٥دا نەمردووە و ئەو ڕەفاقەت و هاوڕێتییە چەند ساڵەیەی لەگەڵ ئەحمەد پاشادا لە ئەستەمبووڵ هەیبووە دەکەوێتە دوای ئەو ساڵە، واتە دوای ئەوەی پاشا لە پاریسەوە گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەمبووڵ و (نالی)یش لە شامەوە چووە بو لای بۆ ئەوێ. لەم وتارەی خۆدزکۆدا دوو دەنگوباسمان لەبارەی نالییەوە بۆ تۆمار کراون، بێجگە لە ناساندنێکی کورت. دەنگوباسی یەکەمیان ئەوەیە کە ئەحمەد پاشا بە خۆدزکۆ دەڵێ: مەلا خزر، کە زیاتر بە ناوە ئەدەبییەکەی وەک نەعلی ئەفەندی ناسراوە، لە سووریایە، لە شام. دەنگوباسی دووەمیش ئەوەیە کە نالی پێشتر ڕێزمانێکی عەرەبیی تەرجەمەی کوردی کردووە. ئەم دوو دەنگوباسە لەبەر ئەوە گرنگن چونکە نە پێداهەڵدان و نرخاندنن و نە خەیاڵ، بەڵکە ڕاستەقینەی لەو بابەتەن کە بناغەی ماددییان هەیە؛ پاشا دەزانێت کە مەلا خزری نالی لەو کاتەدا لە سووریایە و لەوێ

---

[14] محەمەد، مەسعوود: چەپکێک.........ل: شەستودوو.

دەژی، هەروەها باسی کتێبێک دەکات کە کردوویەتی بە کوردی و دەبێ پاشا خۆی چاوی بەو کتێبە تەرجەمەکراوە کەوتبێت. چونکە دەڵێ پێشتر ئەو کارەی کردووە، واتە پێش ئەوەی ئەم بێت بۆ پاریس. ئەگەر پاشا لە قسەکەی خۆی دڵنیا نەبووایە دەیگوت بیستوومە کتێبێکی وای هەیە، یان دەیگوت خەریکە کتێبێکی وا ئامادە دەکات. هەرچی ناساندنەکەیە بە ڕادەی یەکەم هەڵوێستی ڕێز و شانازیی پاشایە بۆ نالی، نەک ڕاستەقینەی ماددی. ئەم ناساندنەیش دوو بەشە: یەکەمیان ئەوەیە کە نالی زانایەکی بەناوبانگە، دووەمیش ئەوەیە کە خۆی بۆ دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی تەرخان کردووە. سەرباری ئەوانەیش پاشا بەڵێنی بە خۆدزکۆ داوە کە بە نالیی بناسێنێت، واتە کارێک بکات خۆدزکۆ و نالی دەستیان، یا دەنگیان، بە یەکتری بگات، بۆ ئەوەی لەبارەی زمانی کوردییەوە هاوکاری بکەن. دیارە لەمەیشدا پاشا هەم ڕیالیستانە بیری کردووەتەوە و هەمیش خۆنزمگرانە، چونکە زانیویەتی ئەو هەموو زانیارییەی بۆ کارەکەی خۆدزکۆ پێویستن ئەم دەڕۆستیان نایەت و پێی هەڵناسووڕێت، لەبەر ئەوە وای بە چاک زانیوە بە کەسێکی بناسێنێت کە لە خۆی شارەزاترە و لەم بوارەدا دەستڕۆیشتووە. خاڵێکی سەرنجڕاکێش، بۆ من، ئەوەیە کە لە قسەکانی پاشا و خۆدزکۆیشدا نالی وەک شاعیر باس نەکراوە، بەڵکە وەک زانا و زمانەوان و فیلۆلۆگیست و وەرگێڕ. تەنانەت لە دوا بەشی لێکۆڵینەوەکەدا خۆدزکۆ هەندێ شیعری بڵاو کردووەتەوە، کە هیی باباتاهیری هەمەدانین، کەچی شیعری نالیی بڵاو نەکردووەتەوە و باسیشی ناکات. هیچ گومان لەوەدا نییە کە پاشا دەیزانی نالی شاعیرە و شاعیرێکی گەورەیشە، چونکە ئێمە دەزانین بە هۆی مردنی سلێمان پاشای بابان و هاتنە سەر تەختی هەر ئەم ئەحمەد پاشایە خۆیەوە، نالی شیعرێکی جوان و بەرزی نووسیوە:

تا فەلەک دەورەی نەدا، سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو

کەوکەبەی میهری موبارەک تەلعەتی پەیدا نەبوو.

ئەو شیعرەیشی نەوتبایە، دیسان پاشا هەر دەیزانی نالی شاعیرێکی گەورەیە، چونکە ناوبانگی نالی ئەو کاتە زۆر لە سنووری میرنشینیی

بابان بەولاوەتریش ڕۆیشتبوو. ئەوجا خۆدزکۆیەک هێندە بە پەرۆشەوە بوو بێت کار لەسەر زمان و ئەدەبی کوردی بکات، بۆچی داوای لە پاشا نەکردووە هەندێ لە شیعرەکانی نالیی بۆ بنووسێتەوە، یا تەنانەت یارمەتیی بدات بۆ ئەوەی بیانکاتە فرانسی؟ خۆدزکۆ وەک زانایەکی ئەوروپایی بێگومان ئەم داوایەی لە پاشا دەکرد ئەگەر بیزانیایە نالی شاعیرێکی گەورەیشە. کەواتە، من هیچ بە دووری نازانم کە ئەحمەد پاشا باسی شاعیرێتیی نالیی لای خۆدزکۆ نەکردبێت. کە باسیشی نەکردووە، دەبێ لە دڵی خۆیدا بڕیارێکی وا گرنگی دابێت، دەنا چۆنە لە ماوەی ئەو یەک ساڵ و چەند مانگەدا کە پێکەوە کاریان کردووە و پاشا لە پاریس ژیاوە، تاکە جارێک لە دەمی دەرنەچووە بە خۆدزکۆ بڵێ کە نالی نەک هەر زمانزانە، بەڵکە شاعیرێکی گەورەی کوردیشە. تەنانەت کە بەڵێنی ئەوە دەدات بە یەکیان بناسێنێت، بەو نیازە دەیکات کە نالی لە بارەی زمانی کوردییەوە کۆمەکی خۆدزکۆ بکات. کە بەڵێنی ئەوەیش دەدات دیوانی شیعری کوردیی بۆ پەیدا بکات (مەجمووعە، ئانتۆلۆگی)، باسی شیعرەکانی ئەحمەدی خانی دەکات (لەبەر هۆیەک کە من تێی نەگەیشتم، پاشا بە دابل یا دابەل ناوی دەبات) و باسی مەموزینی بۆ دەکات. پاشا کە باسی نالی دەکات دەڵێ (ناوە ئەدەبییەکەی) نەعلییە، بەڵام کە باسی شێخ ئەحمەدی دەکات دەڵێت (تەخەللوص)ی دابلە. ئەوەی شارەزای شیعری ڕۆژهەڵاتیی فارسی و کوردی و عوسمانی بێت دەزانێت وشەی (تەخەللوص) تەنیا بۆ ناوی شاعیران بە کار هێنراوە. تۆ کە وتت مەلا فلانکەس تەخەللوسی فلانە، ئیدی ئێمە دەزانین ئەو زاتە شاعیرە.

ئەحمەد پاشا بە خۆدزکۆی نەگوتووە کە نالی شاعیرێکی گەورەی کوردە، بەڵام دەیەوێ کارێکی وا بکات خۆدزکۆ بتوانێت پێوەندیی پێوە بکات، بەشکەم نالی بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی هاوکاریی بکات و یارمەتیی بدات. باشە خۆ دەبێ پاشا ئەوەی لە بەرچاو گرتبێت کە ئەگەر سبەینێ نالی و خۆدزکۆ چاویان بە یەکدی کەوت یا نامەیان بۆ یەکتر نووسی، ئەم ڕازە ئاشکرا دەبێت و ئەودەم هەم نالی و هەم خۆدزکۆیش دڵیان لێی دەڕەنجێت. ئایا دەکرێ وای دابنێین کە پاشا،

لەبەر هەر هۆیەک بێت، لە نالی دڵگران بووە؟ بۆ نموونە لەبەر ئەوەی نالی پێش ڕووخانی ئەمارەتی بابان سلێمانیی بە جێ هێشتووە. ئەمە نابێتە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئەوەی پاشا باسی شاعیرێتیی نالیی نەکردبێت. پرسیارێکی دیکە ئەوەیە ئایە دەکرێ پاشا شاعیرێتی و شاعیربوونی پێ شتێکی ئەوەندە گرنگ نەبووبێت کە شایانی باسکردن بێت؟ ئەمەیش زۆر جێی باوەڕ نییە. هەر نەبێ پاشا لەوە گەیشتووە کە زانایەکی وەک خۆدزکۆ عەوداڵی ئەوەیە شیعری کوردیی دەست بکەوێت، ئیتر بۆ دەبێ شاعیرێتیی نالیی لێ بشێرێتەوە؟ ئێستا کە ئەم وتارە دەنووسم، من هیچ بەڵگەیەکی مەنتیقیی وام بە بیردا نایەت بڕێک ڕووناکایی بهاوێژێتە سەر باسەکە. لەبەر ئەوە بە پێشکەشکردنی ئەو پرسیار و گومانانە، جارێ، ئەم پەنجەرەیە دادەخەم. پاشای بابان کە باسی نالی بۆ خۆدزکۆ دەکات پێی دەڵێ کە نالی کتێبێکی لەسەر ڕێزمانی عەرەبی تەرجەمەی کوردی کردووە. ئەم دەنگوباسە لەلایەن پاشاوە هیچ گومانی تێدا نییە. مامۆستا مەسعوود محەمەد لە کتێبەکەی خۆیدا بە جەختەوە باسی ئەوە دەکات کە کتێبێکی وا هەبووە و وا پێ دەچێت لە مزگەوتەکاندا خوێنرابێت. مامۆستا دەڵێ مەلا محەمەدی مەلا ئیبراهیم (دلاوەر) باسی ئەم سیپارە (نامیلکە)یەی کردووە و تەنانەت بەیتێکی لێ لە بەر بووە؛ کە ئاوا بووە:

گۆشتی قەڵەو حوققە بە چواردە پارە
وەقتێ گوتت حوققە ضەمیر دیارە.

خۆدزکۆ دەڵێ پاشا بەڵێنی داوەتێ کە کۆمەڵە شیعرێکی شێخ ئەحمەد (ی خانی)ی بۆ پەیدا بکات. ڕاستییەکەی نە پاشا و نە خۆدزکۆ ناوی (خانی)یان نەهێناوە، بەڵام هیچ گومان لەوەدا نییە کە مەبەستیان خانیی شاعیری گەورەی کورد و خاوەنی داستانی نەتەوایەتیی کورد مەموزینە. پاشا وەک (شێخ ئەحمەدی) ناوی بردووە و ئەوەیشی وتووە کە لە جەزیرە لە دایک بووە، هاوسەردەمی شاعیر و سۆفیی گەورە جامی بووە و پۆیەمێکی هەیە ناوی (مەموزین)ە. لەم سێ قسەیە تەنیا باسی مەموزینەکەیان ڕاستە، دەنا خانی (١٧٠٧-١:١٦) لە

بایەزید لە دایک بووە و زۆر دوای جامی (کە ساڵی ١٤٩٢ مردووە) لە دایک بووە و ژیاوە. بە دووریشی نازانم پاشا لەنێوان خانی و مەلای جەزیریدا (کە هەردووکیان ناویان شێخ ئەحمەدە) باسەکەی لێ تێک چووبێت، چونکە زۆرتر ناوی جەزیری لەگەڵ جامیدا دەبرێت، ئەگەرچی لای هەردوویان، جەزیری و خانی، باسی جامی کراوە. نازانم پاشا ئەم ناسناوی (دابل یا دابەل)ەی لە کوێوە هێناوە؟ چونکە هێندەی من ئاگادار بم، نە خانی و نە جەزیری ناسناو و تەخەللوسی وایان نەبووە. هەروەهایش نایەت بە بیرمدا شاعیرێکی دیکە هەبێت تەخەللوسی دابل بووبێت. با ئەم نهێنیەیش بچێتە سەر ئەوانی پێشتر.

خۆدزکۆ کۆمەڵێ دەنگوباسی لەبارەی چالاکیی کوردناسەکانەوە بڵاو کردووەتەوە، کە وا پێ دەچێت پێوەندیی لەگەڵ زۆربەیاندا هەبووبێت و ئاگاداری کارەکانیان بووبێت. ئەمەیش لە دنیای تۆژینەوەی ئەکادیمیدا نائاسایی نییە. لەناو هەواڵەکاندا یەکێکیان زیاتر سەرنجی ڕاکێشام. دەڵێ لە ژێر چاودێریی پرۆفیسۆر فۆن دۆرندا خەریکی وەرگێڕانێکی کوردیی گوڵستانن. بێگومان کە دەڵێ گوڵستان مەبەستی گوڵستانی سەعدیی شیرازییە (١٢٩٢-١١٨٤). ئەوانەی خەریکی ئەو کارەن، کێن؟ دیار نییە. هەروەها ئەوەیشم لا ناڕوون مایەوە، ئایا پێشتر گوڵستان تەرجەمەی کوردی کراوە و (ئەو کەسانە) خەریکن بۆ چاپ ئامادەی دەکەن؟ یا هەر ئەو کەسانە خۆیانن کە دەیکەنە کوردی؟ من زیاتر بۆ ئەوە دەچم کە تەرجەمەکە پێشتر کراوە و یەکێک، یان هەندێک، لە کوردناسەکان خەریکە/ خەریکن بۆ چاپ ئامادەی دەکەن.

م. ڕۆدینکۆ لە کتێبێکی خۆیدا لەسەر دەستنووسە کوردییەکانی لینینگراد باسی دەستنووسی (گلستان شیخ سعدی بە زبان کردی) دەکات، کە لێرخ لەگەڵ کۆمەڵێ تێکستی کوردیدا بڵاوی کردووەتەوە. ئەو تێکستە لای من هەیە و هێناومەتە سەر ڕێنووسی ستانداردی کوردی و چەند جارێکیش وەک کۆرسی خوێندنی تێکستی کلاسیکی، خوێندکارانی بەشی کوردیی زانستگەی ئۆپسالا خوێندوویانە.

لەناو ئەو ڕستە و تێکستانەدا کە خۆدزکۆ تێکهەڵکێشی وتارەکەی خۆی کردوون، ڕستەیەک زۆر سەرنجی ڕاکێشام، نەک لە ڕووی

زمانەوانی و شێوەی دارشتنیەوە، بەڵکە لەو ڕووەوە کە پێوەندیی بە ژیانی فەرهەنگیی ئەو سەردەمەوە هەیە. ڕستەکە ئەمەیە: منداڕەکی کە کتێبێکی دڕی. ئایا لەو سەردەمەدا کتێب ئەوەندە زۆر هەبووە کە منداڵ دەستی پێ بگات و بیدڕێت؟ باوەڕ ناکەم لە کوردستاندا وا بووبێت، چونکە کتێبی چاپکراو لە کوردستاندا ڕەنگە لە (قورئان) بەولاوە هیچ کتێبێکی دیکە نەبووبێت. ئەو کتێبانەیش کە دەستنووس بوون و بەرگیان تێ گیراوە و مەلا و فەقێ و ڕووناکبیران خوێندوویانن و خوێندوویاننەوە، ئەوەندە بەنرخ و ڕێزلێگیراو بوونە کە ناکرێ وا بە ئاسانی کەوتبێتنە بەر دەستی منداڵ تا بتوانێ بیاندڕێت. من وای بۆ دەچم خۆدزکۆ خۆی ڕستەکەی دارشتووە و داوای لە پاشا کردووە بۆی بکاتە کوردی.

خۆدزکۆ دوا بەشی وتارەکەی تەرخان کردووە بۆ شیعری کوردی و لە پاڵ گلەییکردنندا لەوەی دابل (خانی؟) زۆر وشەی عەرەبیی بە کار هێناوە، دوو نموونەی لە دووبەیتییەکانی باباتاهیری هەمەدانی (عوریان)ی بڵاو کردووەتەوە. هەردوویان پڕن لە هەڵە و زۆر بێ سەروبەرن. دووبەیتیی یەکەمیان دەبێ بەم جۆرە بێت :

الاله کوهساران هفتەای بی
بنوشە جوکناران هفتەای بی
منادی می کرم شهرو بشهرو
وفای گلعذاران هفتەای بی[15]

دووبەیتیی دووەم تێکەڵ و پێکەڵییەکی وایە کە بە ئاسانی (هەر نەبێ بۆ من و لەم کاتەدا) چار ناکرێ .

خۆدزکۆ لە وتارەکەیدا دەڵێ شاری سلێمانی لە ساڵی ١٧١٤ بنیات نراوە. ئەوەی تا ئێستا زانراوە و بۆتە ڕاستییەکی چەسپیو ئەوەیە کە سلێمانی لە ساڵی ١٧٨٤ دا بنیات نراوە. ئەوجا ئایا خۆدزکۆ ئەم قسەیە لە خۆیەوە دەکات، یا ئەویش یەکێکە لەو زانیارییانەی لە ئەحمەد پاشای وەرگرتووە؟ ئەمەیش ڕوون نییە.  پاشا لە تێکستێکدا باسی

---

[15] همدانی، باباطاهر: اسپیدەباز، اقبال، بهار ١٣٧١، ل٤٤.

ژیانی پاشایەتی دەکات. ڕەنگە ئەمە تێکەڵییەک بێت لە ئەزموونی ڕابوردووی خۆی. هیی ئەو سەردەمەی کە پاشا بووە و هەندێکیش خەیاڵ و فانتازی کە ئەگەر پاشا بێت چی دەکات و چۆن دەژی. لەناو ئەو ڕابواردنە خۆش و گرنگانەدا کە دەیانگێڕێتەوە باسی لە خەنە (حەنا) گرتنی پێی و لە خەنە (دیسان حەنا) و وسمەگرتنی ڕدێنی (ڕیشی) دەکات. وا پێ دەچێ ئەم ڕەنگکردنی پێ و ڕیشە لەو سەردەمەدا لەناو پیاوانیشدا باو بووبێت. دەنا دەزانم لەناو ژناندا (ڕەنگکردنی ڕیش نا!) هەر هەبووە و ئێستایش ماوە. لە گەرمیان ئەو پیاوانەی کاری سەختیان بە دەست دەکرد (بۆ نموونە دروێنە، قوڕکاری، داربڕین...هتد) ناولەپیان دەگرتە خەنە، بەو نیازەی کە ببێتە هۆی پتەوبوون و بەهێزبوونی پێستی دەستیان، بۆ ئەوەی بەرگەی کارکردن بگرێت. خەنە لە عەرەبیدا بە شێوەی (حەنناء) دەگوترێ و لە فارسیدا (حەنا)یە. وادیارە ئەو کاتە لە سلێمانی شێوەی فارسیی وشەکە باو بووە. نازانم وشەی (خەنە) لە کەیەوە پەیدا بووە. نالی لە شیعرێکدا هەر ئەو شێوە فارسییەی وشەکەی بە کار بردووە:

وەرە بنواڕە دوودەستی حەناییم

حەنایی چی؟ هەموو خۆ خوێنە قوربان!

هەر لەو تێکستەدا پاشا باسی ئەوە دەکات کە پیاوەکان یا ڕاوکەرەکان (فۆتە)یان بە سەرەوە بووە. فۆتە (بە عەرەبی فوطە) بە پارچەپەڕۆیەک دەگوترێ کە دەکرێتە پشتێن یا دەبەسترێ بە سەرەوە، یا وەک دەستماڵ و خاولی بە کار دەبرێت. فەرهەنگی (المنجد) دەڵێ گوتراوە وشەکە لە بنجدا سندییە و گوتراویشە تورکییە. بەڵام فەرهەنگی (Redhouse)ی تورکی-ئینگلیزی دەڵێ وشەکە عەرەبییە. پێم وایە ئەمڕۆ لە خوارووی کوردستان وشەکە نەماوە و تەنیا لەبەر ئەوەی ژنی عەرەبی عیراقی فۆتە دەبەستن بە سەرەوە، ڕەنگە هەندێ کەس بزانن فۆتە چییە.

خۆدزکۆ وتارەکەی بەوە تەواو دەکات کە لە ژمارەیەکی داهاتوودا بەشێکی تری نووسینەکەی بڵاو دەکاتەوە، بەڵام، بە داخەوە، وا دیارە لەبەر هەر هۆیەک بێت، نەیتوانیوە ئەم بەڵێنەی بباتە سەر. ڕەنگە لەبەر

ئەوە بوو‌بێت دەستی نەگەیشتبێتە کەسێک کە کوردی زمانی زگماکی بووبێت؛ ئەحمەد پاشا، نالی یا هەر کەسێکی دیکە. نووسەر وتارەکەی ساڵی ١٨٥٧ بڵاو کردۆتەوە، واتە بە لای کەمەوە دوو ساڵ دوای ئەوەی ئەحمەد پاشا پاریسی بە جێ هیشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەمبووڵ.
بەداخەوە ئێمە لە بارەی ژیان و مردنی ئەحمەد پاشاوە زۆر کەم دەزانین. ڕەنگە هێشتا ئەو یەکێک بێت لەوانەی بەختێکی باشی هەبووە و سەری پاریسی داوە و ڕۆژهەلاتناسێک چاوی پێی کەوتووە و هەندێ زانیاریی لەبارەوە تۆمار کردووە و هەندێ زانیاریی لێ وەرگرتووە. من بە دووری نازانم لە ئەرشیڤەکانی وەزارەتی دەرەوەی فرانسادا بەڵگەنامە لەسەر ئەحمەد پاشا هەبێت، چونکە بێگومان ئەو بە شێوەیەکی ڕەسمی هاتووە و ڤیزای وەرگرتووە و سەری نەخۆشخانەی داوە و ماڵی گرتووە و زۆر لایەنی دیکەی ژیانی ڕۆژانەیش کە ئەگەر هەموویشی نەبێت، ئەوا هەندێکی پێویستی بەوە بووە بە نامەی ڕەسمی بکرێت. بریا کەسێک هەبێت هەندێ کات بۆ ئەو ئەرکەیش تەرخان بکات.

## ئەنجامگری

ئەلیکساندەر خۆدزکۆ وەک زانایەک و ڕۆژهەلاتناسێک هەوڵێکی زۆر چاکی داوە بۆ ئەوەی زانیارییەکی باشی لەسەر زمانی کوردی دەست بکەوێت و لە چواچێوەی کارێکی زانستیدا ڕێکیان بخات و پێشکەشیان بکات. ئەویش وەک هەموو ڕۆژهەلاتناسەکان و کوردناسەکان ڕەنگە مەبەستێک یا کۆمەڵە مەبەستێکی هەبووبێت. بەلام لە چەند جێگەی وتارەکەیدا وا هەست دەکەیت جۆرە دڵسۆزییەکی بۆ کورد هەیە و حەز دەکات بەرگری لە خۆیان و زمانەکەیان بکات. هەرچۆنێک بێت، ئەنجامی ئەو هەڵ و کۆششانەی خۆدزکۆ کارێکی زانستییە کە بێگومان بۆ ئەمڕۆی لێکۆڵەرەوە و توێژەرەوەی کورد نرخی خۆی هەیە. لە ڕووی زانستی و مێتۆدی کارەوە دەکرێ هەندێ ڕەخنەمان لە

کارەکەی هەبێت، چونکە کۆمەڵێ هەڵەی تێدایە. بەشێک لە هەڵەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەحمەد پاشا کە زانیارییە زمانەوانییەکانی داوەتێ و تێکستەکانی بۆ ئامادە کردووە، بەڵام بەشێکیش هەڵەی خۆدزکۆ خۆیەتی. من کە دەڵێم هەڵەی هەیە، کارەکەی ئەو لەگەڵ کاری زانایان و ڕۆژهەڵاتناسانی دیکە بەراورد دەکەم، ئەگەرنا زۆر چاک ئاگاداری ئەوەم کە تەنانەت ئەمڕۆیش، لەو کوردستانەی خۆماندا دەیان کتێبی ڕێزمانی کوردی دەنووسرێن کە فڕیان بەسەر زانست و بەسەر زمانەوانی و بەسەر کوردییەوە نییە.
ئەحمەد پاشا سەردارێکی لێکەوتووی کورد و میرێکی بابان بووە، کە ڕۆژگار پشتی تێ کردووە و لە ئاوارەییدا ژیاوە، چ لە ئەستەمبووڵ و چ لە پاریس. سەرباری ئەوەیش نەخۆش و لەشبەبار بووە. ئەوجا لەناو ئەو جۆرە ژیانەدا کە هاتووە هاوکاریی خۆدزکۆی کردووە و هانی داوە کاری زیاتر بکات، بەڵێنی داوە خەڵکی شارەزای بۆ پەیدا بکات، بەڵێنی داوە کەشکۆڵ و نموونەی شیعری کوردیی بۆ پەیدا بکات، ئەرکێکی ڕاپەڕاندووە کە بەڕاستی لە توانستی فیزیکی و عەقڵیی ئەو بە دەر بووە. ئەم دوو پیاوە بەم کارەیان خزمەتێکی زۆری زانستیان کردووە و بەرهەمێکی بەنرخیان بۆ بە جێ هێشتووین.
ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پاڵ ڕانانێکی زانستییانەی ڕێزمانی کوردیدا، کۆمەڵێ دەنگوباسی سیاسی، فەرهەنگی و کومەڵایەتیشی بۆ پاراستووین کە بۆ ئەمڕۆ نرخێکی زۆریان هەیە. ئەگەر ڕۆژێک بمانەوێ مێژووی زمانی کوردی و مێژووی ڕێزمانی کوردی بنووسین، بێگومان کەرەستە و بابەتی وەک ئەم وتارەی خۆدزکۆ دەبنە بەشێکی بنچینەیی و کەڵکێکی زۆریان دەبێ بۆ گەیشتن بە ئەنجامی زانستی و ڕاست.
سۆللەنتونا، سوێد، مانگی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥

## سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە:

١. محەمەد، مەسعوود: چەپکێک لە گوڵزاری نالی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

2. Mackenzie, D. N.: Kurdish Dialect Studies, Oxford University Press, London 1961.

٣. مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عبد الكريم: دیوانی نالی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

٤. مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عبد الكريم: دیوانی مەحوی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەغدا ١٩٧٧.

٥. مستەفا، شوکور: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٠.

٦. وەهبی، تۆفیق: ئەسڵی پیتەقاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ١٩٧٣، ل:٣٤-٩.

٧. مەلا کەریم، محەمەد: عەقیدەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری [ی] کورد، بەرگی هەشتەم، ١٩٨١، ل: ٢٢٢-١٩٩.

٨. موکریانی، گیو: کوردستان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ١٩٩٩.

٩. هەژار: هەنبانەبۆرینە، فرهنگ کردی-فارسی، سروش، تهران ١٣٦٩.

١٠. همدانی، باباطاهر: اسپیدەباز، اقبال، بهار ١٣٧١، ی ٤٤.

# زمانی کوردی: ئاسۆیەکی نادیار

## ئەزموونی پێشکەوتن، مەترسیی هەرەس

ئەو گۆڕان و گەشەکردنە سیاسییەی لە دوادەیەی سەدەی بیستەمدا لە کوردستانی خوارووودا ڕووی دا، زەمینەیەکی باشی ئامادە کرد بۆ کارکردنە سەر لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵی کوردستان؛ ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی. ئەم بارە تازەیە، بۆ ئەوەی بەردەوام بێت و ڕووەو ئاسۆیەکی جوانتر و ڕوونتر ببرێت، دەبێ بیرکردنەوەیەکی قووڵ و زانستی و وردبین ببێتە ڕێنوێن و سەرپەرشتیاری، ئەگەرنا ناگاتە ئەنجامێکی وەها کە بوون و مانەوە و پێشکەوتنی نەتەوەی کورد و نیشتمانەکەی دەستەبەر بکات. ئەم ئەزموونەی کوردستانی عیراق، لەبەر گەلێ هۆی مێژوویی و سیاسی، کار دەکاتە سەر بوون و داهاتووی بەشەکانی دیکەی کوردستانیش.

ئەزموونی ١٦-١٧ ساڵی ڕابوردوو دەکرێ بە شێوەی جیاواز بخوێنرێتەوە و هەڵسەنگێنرێت، چونکە ئەمە بەو ڕاستییەوە گرێ دراوە کە کێیە دەیخوێنێتەوە و لە چ گۆشەنیگایەکەوە سەرنجی دەدات: لە پێگەی دەستەلات و بەرژەوەندیی تەسک و خۆپەرستانەی دەستەلاتدارەوە، یا لەناو زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردستانەوە کە هەتا ئەمڕۆیش نیاز و پێویستییە سەرەتایی و سادەکانیشیان نەهاتووەتە دی؟ لە هەر بوارێکی ئەم ئەزموونەدا ڕەنگە باسی پێشکەوتن بکرێت، بەلام لە بواری زمان و فەرهەنگدا ئاشکرایە کە ئەوەی ڕووی داوە و ئەوەی ڕوو دەدات کارەساتێکی نەتەوەیی و نیشتمانییە و ئەگەر هەرچی زووتر چارەیەکی بۆ نەدۆزرێتەوە، بەرەو ئەوەمان دەبات کە یەکێک لە کۆڵەکە گرنگەکانی بوون و مانەوەمان وەک نەتەوەیەک و نیشتمانێک هەرەس دەهێنێت و هەموو دەستکەوتەکانیش دەپووچێنەوە.

لە حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا بزووتنەوەیەکی باش کەوتە ناو زمانی کوردییەوە و لە ماوەی ئەو چوار ساڵەی ئاشتیدا گەشەکردن و

پێشکەوتنێکی سەیر هاتە دی، کە کاری کردە سەر تێکڕای پلەی بیر و خوێندەواری و فەرهەنگ لە کوردستاندا. ئەودەم ئەوانەی بەتەواوی خەریکی نووسین بوون و بەرهەمەکانیان بەشێک بوون لە ژیانی ڕۆژانەی خوێنەری کورد ڕەنگە خۆی دابێ لە ٦٠-٧٠ کەسێک. لەناو ئەمانەدا کەسانێک هەبوون کە کوردییەکی لاوازیان دەنووسی و شارەزای ڕێزمان و ڕێنووس نەبوون، بەڵام لە پاڵ ئەمانەیشدا ١٠-١٥ کەسێک هەبوون کە کوردییەکی چاک و جوانیان دەنووسی و دەبوونە نموونە بۆ ئەوەی خەڵکی دیکەیش شتیان لێوە فێر ببن. ئەو کوردیزان و زمانناسانە ڕێگەیان لە خراپەکاریی ئەو خەڵکە ناشارەزایە دەگرت و نەیاندەهێشت کارکردە خراپەکەیان تەشەنە بکات.

ئەمڕۆ ژمارەی ئەوانەی کە دەنووسن یەکجار زۆر بووە. خەڵکێکی زۆر بە هۆی زمانی کوردییەوە دەژین، واتە زمانی کوردی "نان دەدات"، بەپێچەوانەی سەردەمێکی کۆنەوە کە بەکارهێنانی زمانەکە مایەی دەردیسەری بوو. دیارە زۆر خۆشە زمانی کوردی بگاتە ڕادەیەک کە وەک زمانێکی ڕەسمی بە کار بێت و بە جۆرێکی هێندە فراوان بە کار ببرێت کە خەڵکانێک بتوانن پێی بژین. ئەمە شانازییەکی یەکجار گەورەیە بۆ کورد و فەرهەنگەکەی. بەڵام دەردەکە ئەوەیە پلە و ئاستی بەکارهێنانی زمانی کوردی هەتا بڵێی دالەنگاوە و بەرەو خراپی و لاوازی ڕۆیشتووە. ئەمڕۆ بەشی هەرە زۆری ئەوانەی دەنووسن کوردییەکی زۆر خراپ و سەقەت دەنووسن، نە شارەزای ڕێزمان و ڕێنووسن و نە لە جوانی و ئێستێتیکی زمان دەگەن و نە "میزاجی کوردەوارییان" کار دەکات. بەڕاستی ئەمانە زمانەکە ئەتک دەکەن و ئەوپەڕی سووکایەتی بە فەرهەنگی کورد و خوێنەری کورد دەکەن. ئەمانە دەبوو هەر نەبێ وەک سەرچاوەیەکی بژێوی خۆیان و وەک کەرەستەیەکی پیشەیی و وەک ئامرازێک، وەک ئەسبابێکی کار و پیشە هەوڵیان بدایە زمانەکەیان چاک بکەن. کابرای کرێکار کە چەکوش بە کار دەهێنێ، هەوڵ دەدات هەمیشە خزمەتی چەکوشەکەی بکات، پاکی بکاتەوە، مشتووی باشی بۆ دابنێت. وەرزێرێکیش تا بتوانێ خزمەتی داسەکەی دەکات، لە هەسانی دەدات، دەمەزەردی دەکات و لە

شکان و درزبردن دەیپارێزێ و ناهێڵێ ژەنگ بگرێ. نووسەر و ڕۆژنامەنووسانیش دەبوو هیچ نەبێ لەبەر خاتری پیشەکەی خۆیان و نانەکەی خۆیان، بەتەنگ کەرەسەی کار و پیشەکەیانەوە بهاتنایە، زمانەکەیان ئاوا سەقەت نەکردایە. ڕەنگە ئەمڕۆ لە کوردستاندا ٤- ٥ هەزار کەسێک هەبن کە خەریکی کارێکن پێوەندیی بە زمانەوە هەبێت. بەڵام دەردەکە ئەوەیە لەناو ئەم حەشاماتە زۆرەدا ژمارەی ئەوانەی کە دەتوانی پێیان بڵێی زمانزان و کوردیزان ناگاتە ٢٠-٣٠ کەس. ئەوجا ئەم کوردیزانانە لەوانە نین کە ڕۆژانە تەئسیر لە خوێنەر و بینەری کورد دەکەن. کوردیزانەکانی ساڵانی حەفتاکان خۆیان ڕاستەوخۆ لە کاری ڕۆژنامە و ڕاگەیاندندا بەشدارییان دەکرد و بەو پێیەیش جێدەستیان دیار بوو. بەشی هەرە زۆری ئەوانەی ئەمڕۆ لە ڕۆژنامە و حەفتەنامە و مانگنامە و وەرزنامە و ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆنەکاندا کار دەکەن، لە زانستگە و خوێندنەگەکاندا کار دەکەن، ئەوانەی کە ڕاستەوخۆ کار لە زمان و فەرهەنگی خەڵک دەکەن و دەبنە هۆی شەکڵپێدانی زمانەکە لەناو خوێنەرانی ئاساییدا، کوردیزان نین. نەک هەر کوردیزان نین، بەڵکە کوردینەزانن. هەر ئەوانیشن کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زمانی کوردی بەرەو هەڵدێر و بەرەو پوان و بەرەو داڕزان دەبەن. کوردیزانەکانی ئەمڕۆ کەمتر ئەو دەرفەتەیان بۆ دەلوێ ڕاستەوخۆ زمان بخەنە ژێر چاوەدێرییەوە و کۆنترۆڵی بکەن.

## زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین

کامڵبوونی زمان بەستراوە بە قۆناخێکی دیاریکراوەوە و، تا ڕادەیەک، مەسەلەیەکی تاکەکەسییە. ئەو زمانەی کە لە سەردەمی بابانەکاندا بە کامڵ دانراوە، نموونەکەی لە شیعری نالی و شێخ ڕەزادا دەبینین. زمانی سەردەمی شێخ مەحموود لەگەڵ زمانی پەنجاکاندا زۆر جیاوازە. زمانی ئەمڕۆ و حەفتاکانیش زۆر لەیەک ناچن. هەموو زمانێک ئاوایە. ئەگەر نووسەرێکی ئینگلیز ئەمڕۆ وەک شەکسپیر بنووسێت، باوەڕ ناکەم کەسێک بەرهەمەکەی بخوێنێتەوە، یا ڕەنگە گاڵتەیشی پێ بکەن. نووسەرێکی باشی عەرەبیش ئەمڕۆ وەک (جاحظ

و ابو حيان التوحيدي) نانووسێت. بەڵام ئەم زمانانە لە هەموو سەردەمێکدا نۆرمی دامەزراوی خۆیان هەیە و نووسەران و ڕووناکبیران پێڕەویی دەکەن و لێی لا نادەن. کاملبوونی زمان هەر ئەوەیش نییە جوان پێی بنووسیت. دەوڵەمەندیی زمان بەوە دەپێورێ کە بتوانیت لە بوارە جیاوازەکانی زانیاری و زانستدا بە کاری بهێنێت.
زمان هەتا بەرەو ئەوە بچێت یەک نۆرمی ڕێزمانیی هەبێت باشتر کاری پێ دەکرێت. من، هەر بۆ نموونە، هەوڵ دەدەم لایەنێکی بچووکی ئەم باسە ڕوون بکەمەوە. لە زاراوای کوردیی خوارووا، کە وەک زمانێکی ستاندارد ڕۆڵێکی گرنگی هەیە، گێنووس، واتە زایەند یا جنسی ناو، ڕۆڵێکی ئەوتۆی نییە. ناو ئەگەر نێر بێت یا مێ، لە دۆخی کارادا بێت، یا یەکێ لەو دۆخانەی کە لە چوارچێوەی (ئۆبلیک)دا کۆ دەکرێنەوە، دیسان هیچ ناگۆڕێت. تەنیا لە دۆخی بانگکردندا (نداء، ڤۆکاتیڤ، Vocative) جیاوازییەک ماوە. بۆ نموونە ئێمە دەڵێین: کوڕە، مامە، بابە، خاڵە... بەڵام دەڵێین: کچێ، خوشکێ، پوورێ. تەنانەت لەمەیشدا گۆڕان ڕووی داوە. زۆربەی خەڵک دەڵێن (دایە)، کە بەڕاستی دەبوو بگوترێت (دایێ). لە کوردیی سەروودا (کرمانجی) گێنووس ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ و ناوەندیی هەیە، ئەگەرچی لە کرمانجییشدا ڕۆڵی گێنووس گۆڕانی بەسەردا هاتووە. بۆ نموونە ئەو یاسا سەختەی کە دەبێ ناوی نێر لە دۆخی ئۆبلیکدا (ی)ی بچێتە سەر بەتەواوی کز بووە و کەم کەس گوێی دەداتێ یا بە کاری دەهێنێ. لە زاراوای موکریاندا پاشماوەیەکی شێواو و نارێکوپێکی نێر و مێ ماوە و لە قسەکردندا بە کار دەبرێت، بەڵام بە شێوەیەکی، وەک وتم، نارێکوپێک. تۆ ناتوانیت بنەما و قانوون بۆ ئەو جۆرە بەکارهێنانە دابنێیت. ئێستا یەکێک بێت بە کوردیی خواروو شتێک بنووسێت و شێوەی ئۆبلیکی ناو بە کار ببات، بێگومان بە هەڵەی دەزانم و پێم وایە ئەمە تێکدانی زمانە.
لە زمانی ستانداردی کوردیدا ناکرێ جێگەی هەموو شێوە جیاوازەکانی ڕێزمان بکرێتەوە و جێیان پێ بدرێت. هەر بۆ نموونە، لە مهاباد ڕاناوی لکاوی (تان) هەندێ جار دەکرێ بە (وو): نانوو خوارد،

له باتیی نانتان خوارد. یا دۆخ (کاسووس)ی ئۆبلیک لەگەڵ ناودا دەردەکەوێت: چوومە ئەو شارەی، دەچینە ماڵە ئەحمەدی. یا بەکارهێنانی (ببوو) لەجێی (بووبوو). له سلێمانی پاشگری (ـەوانێ) دەخرێتە سەر هەندێ کردار (بەزۆری کرداری ڕانەبوردوو، بەڵام دەمکاتەکانی دیکەیش): ئەڕواتەوانێ، ئەخواتەوانێ. یا هەندێ وشە بە شێوەیەکی سەیر بێژ دەکرێ: (ئەوەنگە) له جێی (ئەوەندە)، (یامێ) له جێی (دامێ). له گەرمیان و له سنه پارتیکڵی ئیزافە نەماوە: (ماڵ باوک ئازاد)، له جێی (ماڵی باوکی ئازاد)، (کوڕ ئازا) له جێی (کوڕی ئازا). له هەولێر پاشگری ڕابوردووی تەواو به (ی) دادەڕێژرێت نەک (وو): (خواردییە، بردییە) له جێی (خواردووە، بردووە)، یا (هەیتم، نووسیتم) له جێی (هەمە، نووسیومە). ئەم فۆرمانە هیچیان ناچنە نێو ڕێزمانی ستانداردی کوردییەوە و بەشێک نین له زمانی ئەدەبی. تۆ دەتوانی ڕۆژانە چۆنت دەوێ وا قسە بکەیت، من کارم بەوە نییە، بەڵام که دەرست به منداڵی کورد وتەوە، که وتارێکت بۆ ڕۆژنامە نووسی، دەبێ زمانی ئەدەبی به کار بهێنی. ڕەنگە بکرێت له ڕۆمانێک، چیرۆکێک، یا شانۆنامەیەکدا هەندێ گفتوگۆی کەسەکان بەو زمانە ڕۆژانەیە بنووسرێت، بەڵام ئەوە شتێکی دیکەیە. من پێم وایە زمانی کوردی دەبێ له دوو پلەی جیاوازدا به کار بهێنرێت؛ زمانی ڕۆژانە، که زمانی قسەکردنە و زمانی ستاندارد که زمانی نووسینە. سنووری نێوان ئەم دوو پلەیەی زمانەکە بۆ کەسێک هەستی زمانەوانیی هەبێت ئاشکرایە و دەبێ ڕەچاو بکرێت. هەبوونی ئەم دوو پلەیە بەو مەعنایە نییە که ئێمە له زمانی خەڵک دوور دەکەوینەوە، بەڵکە پێشاندەری دوو پلە و دوو سیستێمی بیرکردنەوەیە، که له زۆربەی زمانانی دنیادا ئەم دیاردەیە هەیە. هەروەک ئاسانکردن و سادەکردنی زمان ئەوە ناگەیێنێ که ئێمە له گەل و له زمانی گەل نزیک دەبینەوە. تێنەگەیشتنی ئەم جیاوازییە دەبێتە هۆی ئەوەی زۆر جار نووسەران له سنووری تەسکی شۆڤینیزمی ناوچەگەریدا قەتیس بمێنن و زیان به خۆیشیان و به زمان و فەرهەنگەکەیشیان بگەیێنن.

بەکارهێنانی وشە و تەنانەت دەستەواژەی دیالێکتە جیاوازەکانی کوردی لە زمانی ئەدەبیدا نە هەڵەیە و نە تاوانە، ئەگەر بە شێوەیەکی گونجاو و لێزانانە بە کار ببرێن. ئاژاوەی زمان و ناسەقامگیری لەوەوە دروست دەبێت کە تۆ ئەو پێکهاتە ڕێزمانییەی تایبەتی دیالێکتێکە، بیهێنیتە ناو زمانە ئەدەبییەکەوە. من هەر یەک دوو نموونەی بچووک دێنمەوە. لە کوردیی سەروو (کرمانجی)دا ئەگەر ناو لە شێوەی ئیزافەدا هاتبوو، ئەوا ئاوەڵناو ناتوانێ یەکسەر بە دوای ناودا بێت، بەڵکە دەچێتە دوای دەستەواژەکەوە، بەڵام لە کوردیی خوارووودا ئاوەڵناو یەکسەر بە دوای ناودا دێت. نموونە: *کەچا من ئا بچووک، برایێ من یێ خوەندەکار*. ئەمانە بە کوردیی خواروو ئاوا دەوترێن: کچە بچووکەکەی من، برا خوێندکارەکەم. تۆ ئەگەر ئەم دوو ڕستەیە بەپێی نموونە کرمانجییەکە دابڕێژیتەوە، ئاوەهایان لێ دێت: کچەکەی منی بچووک، براکەی منی خوێندکار. لێرەدا کچ و برا بێ ئاوەڵناو مانەوە و(من) ئاوەڵناوی بچووک و خوێندکاری وەرگرت. یا تۆ بێیت فۆرمی پاسیڤ (کارابزر) بە شێوەی کوردیی سەروو دابڕێژیت؛ لە جێی (نووسرا) بڵێی (هات نووسین). نزیککردنەوەی زاراوەکان دەتوانێ ببێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمان، بەڵام بە مەرجێک کەسانێکی کوردیزان و زمانناس و شارەزای مێژووی زمان و ڕەچەڵەکی وشە (ئێتیمۆلۆگی Etymology) بیکەن، نەک کۆلکەخوێنەواری شۆڤینیست. ئەنیستیتووتە (بەناو) کوردییەکەی پاریسیش ئەوە دە دوانزدە ساڵە ملیۆنان دۆلار وەردەگرن گوایە خزمەتی زمانی کوردیی پێ دەکەن، بەڵام ئەوەی ئەوان دەیکەن دژایەتیکردنێکی ئاشکرای زمانی کوردی و تێکدانی زمانی کوردییە. ئەوەندەی ئەوان زیان دەگەیێننە کورد و زمانەکەی تەنانەت داگیرکارە فاشیستەکانیش نەیانتوانیوە بیکەن.

## فەرهەنگێکی بێنەخشە

زۆر جار باسە هەرە گرنگ و بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی کوردەواری بە جۆرێک پێشکەش دەکرێن کە بوارێک بۆ هۆش و بیری زانستی و بۆ بیرکردنەوەی مەنتیقی (لۆگیکی) نامێنێتەوە. هەر ئەم ئاژاوە و ئاڵۆزییە دەرفەتێکی زۆر چاک دەداتە دەست ئەو کەسانەوە کە لە ڕووی زانستییەوە هیچیان پێ نییە، زیاتر دەنگ هەڵبڕن و خۆ ببەنە پێشەوە، نەک بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەک و چارەسەرێک، بەڵکە بۆ شێواندنی ناوەڕۆکی باسەکان و بۆ ونکردن و لەناوبردنی ڕاستی. بابەتی زمان و ئەلفوبێی کوردی یەکێکە لەم باسانە. بەشی هەرە زۆری ئەوانەی لەم بوارەدا دەنووسن و قسە دەکەن ئەوانەن کە نە زمانزانن و نە کوردیزان.

دەستگا و ئۆرگانە ڕەسمی و نارەسمییەکانی ڕاگەیاندنی کوردی لەم ڕووەوە ئەرکێکی یەکجار قورس و نازکیان لەسەرە. ئەمانە دەبوو بە هۆشێکی بەرز و وردی زانستی و نەتەوایەتییەوە لەم بابەتە نزیک بکەوتنایەتەوە[نزیککەوتنەوە:Approach]. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە بەشداریی دەستگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی ڕێک بە پێچەوانەی ئەوەیە چاوەڕوانیان لێ دەکرێت. نەخشی دەستگا و دامەزراوە فەرهەنگی و بەناو زانستییەکانی تریش لە هیی دەستگاکانی ڕاگەیاندن گەشتر و جوانتر نییە. دیارە ئەمە شتێکی زۆر سەیر نییە ئەگەر ئەوەمان لە بیر بێت کە ئێمە نەتەوەیەکین هیچ پرۆژەیەک و هیچ نەخشەیەکمان بۆ داهاتووی فەرهەنگی و زمانەوانیمان نییە. ئێمە نەتەوەیەکین تا ئێستایش شتێکمان نییە ناوی سیاسەتی فەرهەنگی بێت: Cultural Policy. من باسی پرۆژەی سیاسی و ئابووری و کشتوکاڵ و عەسکەری ناکەم، چونکە ئەوانە هیچیان کاری من نین و هیچیشیان لێ نازانم، بەڵام زمان و فەرهەنگ ئەو بوارەیە کە بەشی هەرە زۆری ژیانی خۆمم بۆ تەرخان کردووە و ئەگەر تۆزێک شارەزایی و زانیاریم هەبێت، ئەوا لەم بوارەدا هەمە.

ئەم باسە، ئێستاکە، پێش ئەوەی باسێکی زانستی و زمانەوانی بێت، باسێکی سیاسی و ئیدیۆلۆگییە. خۆی لە بنەڕەتدا نەدەبوو باسێکی

سیاسی بێت، بەڵام چونکە هەم سەرهەڵدان و پەیدابوونەکەی و هەم گەشەکردن و بەردەوامییەکەی زادەی پرۆژە و بیرکردنەوەیەکی سیاسی بووە، ئێستا زۆر زەحمەت و بگرە نەشیاوە ئەو ڕەنگەی لێ بکرێتەوە.

هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە کۆلۆنیالیستانی ئەوروپایی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەستیان خستە ناو کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە و بە تایبەتیش لەناو هەرێمەکانی سەر بە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا. ئەوان ئامانجی یەکەمیان ڕووخاندنی ئەو ئیمپراتۆریایە و دابەشکردنی زەوییەکەی لەناو خۆیاندا و دامەزراندنی دەستەڵاتی سیاسی و عەسکەری و ئابووریی خۆیان بوو. هەر زوویش لەو کارەیاندا سەر کەوتن. کۆلۆنیالیستان ئامانجی درێژخایەن و ستراتیژیشیان هەبوو. بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە ستراتیژییانەیان دەبوو میکانیزمێکی ورد و زیرەکانە و درێژخایەن دابنێن. نزیکترین و کاریگەرترین ڕێگە ئەوە بوو کە گرۆ و تاقم و نەتەوە و ڕەگەزەکانی ناوچەکە لەتلەت و پارچەپارچە بکەن و بیانکەن بە گژ یەکتردا، بۆ ئەوەی هەر هەموویان پێویستیان بە کۆلۆنیالیستان خۆیان ببێت و سەریان بۆ شۆڕ بکەن و ئەمانیش بتوانن بە ئاسانی حوکمیان بکەن. ئەمە ئەو بنەما کلاسیکە هەم کۆن و هەم تازەیەیە کە پێی دەگوترێت:

Divide and rule/conquer

ئێمە کە ئەم پاشخانە ورد بخوێنینەوە ئیتر ئەوەیش باش تێدەگەین بۆچی هەر ئەوانەی کە خاکی کوردستانیان دابەش و پارچەپارچە کرد، ویستیان زمانەکەیشی بەو دەردە ببەن. کورد تا ناوەڕاستی دەیەی سێیەمی سەدەی بیستەمیش هیچ کێشەیەکی ئاڵۆزی زمانەوانی و ئەلفوبێ و ڕێنووسی نەبوو. شاعیر و نووسەری گەورە بەو زمانە نووسیویانە و خوێنەری کورد لە هەر بەشێک بووبێت کەم تا زۆرێک ئاگای لە تێکڕای ئەدەبی کوردی هەبووە. ڕۆژنامەگەریی کوردی هەر لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی پێ کردبوو، لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستیشدا تا ڕادەیەکی باش گەشەی کرد.

# پرۆژەیەکی دوژمنانە

بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی بو نووسینی زمانی کوردی پرۆژەیەکی درندانەی ئیمپەریالیستییە بۆ دوورخستنەوەی نەتەوەی کورد لە هەموو ڕابوردوو و مێژووی خۆی و بۆ لەبیربردنەوەی ڕەگوڕیشە فکری و ڕۆحییەکانی و بۆ ڕاگرتن و پەکخستنی ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی لە بواری زمان و ئەدەبدا لە کوردستاندا، بەتایبەت لە کوردستانی عیراقدا، بە دی هاتبوو، بۆ لەناوبردنی پرۆسێسی بەنەتەوەبوون کە لە سەدەی بیستەمدا سەرکەوتنی باشی چنگ کەوتبوو.

دەکرێ باسی ئەلفوبێ لە ڕوانگەیەکی زانستیی ڕووتیشەوە سەرنج بدەین. ئەلفوبێی کوردی بەو شێوەیەی ئێستای لەوەیە یەک یا دوو ناتەواویی فۆنەتیکیی تێدا هەبن، کە چارکردنیان سەخت و نەکراو نییە. بەڵام ئەلفوبێی لاتینی ـ تورکی بە لای کەمەوە حەوت دانە فۆنیمی ناتەواوە کە بە هیچ جۆرێک ناکرێ تێکستێکی کوردی بێ ئەو فۆنێمانە بنووسرێت. ئەمە ڕێک بە پێچەوانەی ئەو بانگەشە ناڕاست و نازانستییەیە کە هەندێ کۆلکە خوێندەواری کوردینەزانی بێگانەپەرست دەیکەن گوایە تیپی لاتینی دەنگەکانی زمانی کوردی باشتر دەردەبڕێت. ئەوانەی باسی ئەلفوبێی لاتینی تورکی دەکەن تەنانەت ئەو ڕاستییە زۆر سادە و ئاشکرایەیش دەشارنەوە کە نەک هەر کوردیی خواروو، بەڵکە کوردیی سەروویش (واتە زاراوای کرمانجی) ناکرێ بەو ئەلفوبێیە بنووسرێت. ئەمەیش دەبێتە هۆی دۆڕاندن و لەدەستدانی هەم ئەمڕۆ و داهاتوو و هەم ڕابوردوویش. ئێمە ئەگەر سەرنج بدەینە خوێنەوارێک و تەنانەت ڕووناکبیرێکی کوردستانی تورکیا، دەبینین ئەدەبی کلاسیکی کوردی ناناسێت، تەنانەت کلاسیکی کرمانجییش ناناسێت؛ نە مەلای جەزیری و نە ئەحمەدی خانی و نە فەقێی تەیران و

نە شاعیر و نووسەرانی دیکە، کە بەرهەمەکانیان بەڕاستی گەنجینەیەکی بەنرخ و گرنگ و دەوڵەمەندی زمان و ئەدەب و فکری کوردن.
ڕووناکبیرێکی ئەمڕۆی کوردستانی تورکیا ناتوانێت بە ئەلفوبێی لاتینی ـ تورکی شاکارەکانی مەلای جەزیری و ئەحمەدی خانی بخوێنێتەوە، چونکە ئەو ئەلفوبێ تورکییە بۆ زمانی کوردی نەکراوە و دەنگەکانی زمانی کوردی لەگەڵ ئەو ئەلفوبێیەدا ناگونجێن. نووسینەوەی شاکارەکانی جەزیری و خانی و داهێنەرانی دیکەی کلاسیک بە ئەلفوبێی لاتینی تورکی هەموو لایەنە جوان و هونەری و ڕەوانبێژییەکانی ئەو تێکستانە دەسڕێتەوە و دەیانکاتە کۆمەڵە وشەیەکی دزێوی بێگیان. هەر لەبەر ئەوەیشە دەبینین کە ڕووناکبیر و نووسەرانی تازەی کوردستانی تورکیا و سۆڤیێتی جاران نەیانتوانیوە هیچ کارێکی گرنگی لێکۆڵینەوە یا وەرگێڕان لەسەر شاکارەکانی جەزیری و خانی بکەن. ئەوەی لەم بوارەدا کاری زانستی و بنەڕەتانەی کردووە، نووسەر و ڕووناکبیرانی کوردستانی عیراق و ئێران و هەندێکیش سووریان (عیزەدین ڕەسوول، هەژار، سادق بەهائەددین، مەلا ئەحمەدی زڤنگی، ڕەشید فندی...). لە کوردستانی باکوور ئەگەر نووسەرێکی وەک مامۆستا محەمەدئەمین بۆزئەرسلان کاری گرنگی لە بواری کلاسیکی کوردیدا کردووە، لەبەر ئەوەیە کە ئەو پیاوە بەرهەمی مزگەوتەکانی کوردستانە، نەک سیستەمی خوێندنی ئەتاتورک.
هەر ئەم نەناسینی ڕابوردووە لە بوارێکی دیکەدا زۆر بەئاشکرا دەبینرێت، ئەویش بواری شیعرە، چ وەک ناوەڕۆک و چ وەک فۆرم. شیعر لای شاعیرانی کوردستانی تورکیا و سۆڤیێت زۆر لاواز و دواکەوتووە، بگرە هەر شیعر نییە. بێجگە لەوەیش لە ڕووی فۆرمەوە بە هیچ جۆرێک شارەزای کێش نین، نە کێشی کلاسیکی عەرووزی و نە کێش و مۆسیقای تازە. چونکە ئاگاداری ڕابوردووی شیعری کوردی نین و لەو گەنجینە گەورە و دەوڵەمەندە هیچ سوودێکیان وەرنەگرتووە و نایشتوان سوود وەربگرن. وەک ناوەڕۆک و میتافۆر

و زمانیش ئەو شیعرەی شاعیرانی کوردستانی باکوور دەینووسن بە هیچ جۆرێک ناچێتەوە سەر ڕەگوڕیشە کوردانەکەی شیعری کلاسیکی کوردی، کە ئەویش گەوێکی ڕەنگدار و گرنگ و بەرزی زنجیرەی شیعر و فەرهەنگ و شارستانەتیی ڕۆژهەلاتە.

ئەلفوبێی کوردی لە ماوەی، بە لای کەمەوە، هەزار ساڵی ڕابوردوودا دەستاوێژی نووسین و کەرەستەی تۆمارکردنی بیری بیریاران و خەیاڵی شاعیران و بەرهەمی داهێنەرانی دیکە بووە. لە ماوەی ئەو هەزار ساڵەیشدا، سیستەمی بەکارهێنانی ئەلفوبێیەکە پێش خراوە و چاکسازیی تێدا کراوە، تا گەیشتووەتە ئەمڕۆ و بووەتە یەکێک لە ئەلفوبێ پێشکەوتووەکانی ڕۆژهەلات. ئەگەر تەنیا لە ڕووی بەرژەوەندیی نەتەوایەتیی کوردیشەوە باسەکە لێک بدەینەوە، خۆ دیارە کە ئەمڕۆ لە سەرجەمی هەموو ئەوەی بە زمانی کوردی دەنووسرێت تا ٩٠% و بگرە زیاتریشی بە ئەلفوبێی کوردی دەنووسرێت، واتە تەنیا ١٠% بە ئەلفوبێی لاتینی تورکی دەنووسرێت. ئەو بەشەیش نە لە ڕووی زمانەوانی و نە لە ڕووی هونەری و ئێستێتیکییەوە ناکرێ لەگەڵ بەشە زۆرەکەدا بەراورد بکرێت.

ئەمڕۆ کەسانێک هەن کە لەبەر نەزانی و ناشارەزایی هەر لە خۆیانەوە پێیان وایە بەکارهێنانی لاتینی گرفتەکانی زمانی کوردی چارەسەر دەکات .من ناڵێم گرفتمان نییە، بێگومان هەیە. بەڵام ئەو کەسانە بەڕاستی هەر نازانن گرفتەکان چین و ئەوەی دەیڵێن نیشانەی تێنەگەیشتن و نەخوێندەوارییانە. هەندێکیش هەر لەبەر ڕۆژاواپەرستی کەوتوونەتە دوای ئەم بیرە و پێیان وایە هەر بەوەی ئەلفوبێ بگۆڕین ئیتر دەبینە ئەورووپایی و لەم "ڕۆژهەڵاتە پیس و دڕندە و دواکەوتووە" ڕزگار دەبین. ئەتاتورکیش ڕێک وای بیر دەکردەوە، بەڵام ئەوە حەفتا ساڵە ئەتاتورک مردووە و نەتەوەی تورکیش نەبوو بە ئەورووپایی و ناشبێت.

کەمالیزم (واتە شوێنکەوتنی باوەڕەکانی مستەفا کەمال ئەتاتورک) لەناو کورددا گەشەی کردووە و پێگەیەکی پەیدا کردووە. تەنانەت زۆربەی ئەوانەی کە لە ڕووی سیاسییەوە دژی دەوڵەتی تورکیان، بێ

ئەوەی بە خۆیان بزانن، لە ڕووی ئیدیۆلۆگی و فەرهەنگییەوە شاگرد و قوتابیی دلسۆزی کەمالیزمن و زۆریش بەگەرمی خەبات بۆ سەرکەوتنی ئەو باوەڕانە دەکەن. بلاوکردنەوەی ئەلفوبێی لاتینی تورکی بڕگەیەکی گرنگی بەرنامەی سیاسیی ئەم ئیدیۆلۆگییە و ئەو کەسانەیشە کە دوای کەوتوون و کاری بۆ دەکەن.

## دەرفەتێک و هیوایەک

لە کوردستانی خوارووودا، کە ئێستا دەستەڵاتی سیاسی بە دەست هێزە سیاسییەکانی کوردستانەوەیە، دەرفەتێکی یەکجار باش هەیە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی زمانی کوردی و پێشخستنی زمانەکە. ئێمە زمانێکی ستانداردمان هەیە و زۆر چاکیش دەتوانێت ببێتە زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی کوردستان. ئێمە تەنیا پێویستمان بەوەیە هەوڵ بدەین ئەم زمانە دەوڵەمەندتر بکەین و لە گەنجینەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی سوود وەربگرین. هەروەها دەتوانین کێشەی ڕێنووس بەئاسانی چارەسەر بکەین و بە جۆرێکی زانستی بنەماکانی بچەسپێنین. ئەمە بە تاکەکەس ناکرێت، دەبێ دەستەڵاتی سیاسی هێندە بوێر و دڵسۆز و هۆشیار و دووربین بێت، تا بتوانێت بێ ترس و دڵەڕاوکێ چارەسەرکردنی کێشەی زمان بکاتە یەکێک لە پڕۆژە سەرەکی و گرنگەکانی خۆی. دەستەڵاتێکی سیاسیی وەها دەتوانێت کوردستانی خواروو بکاتە ناوەندێک بۆ فەرهەنگ و زمان و شارستانەتییەکی ڕەسەن، دەوڵەمەند، پێشکەوتوو، تازە و مرۆڤانە. دەتوانێت ئەم بەشە بکاتە ڕووگەیەک بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستان بۆ ڕزگاربوون لە فەرهەنگی داگیرکاران و ژێردەستی و دواکەوتن و بێبەشبوون لە فەرهەنگی نەتەوایەتیی خۆیان.

# زمان و ئەلفوبێی ستانداردی کوردی لە ڕوانگەیەکی مێژوویی و زانستییەوە
## (کورتەیەکی بنەماکان)

### یەک: ڕەگی کێشەکە

دیاردەی لەیەکدابڕانی کورد، یەکەم جار، دوای دابەشبوونی کوردستان و چەسپاندنی سنوورە سیاسییەکانی نێوان دەوڵەتە تازەدامەزراوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستی پێ کرد. بەڵام دابڕانی دووەم، کە خەتەرناکتر و قووڵتر بوو، دوای پەیدابون و تەشەنەکردنی ئەلفوبێی لاتینی ڕووی دا. دابڕانی یەکەم ڕووالەتی بوو، نەک فەرهەنگی، چونکە پێوەندی مرۆڤی کورد لە بەشە جیاوازەکانی کوردستاندا هەر مایەوە، ئەگەرچی هەندێ کۆسپی ڕەسمی خرایە نێوانیانەوە، وەک هاونیشتمانێتی و پاسپۆرت و ڤیزە. کەچی دابڕانی دووەم زۆر خراپتر بوو، ئەنجامی کاریتری لێ کەوتەوە و درزی قووڵتری خستە نێوانەوە. ئەمە نەخشەیەکی دوژمنانەی نوێتر بوو. ئەوانەی وڵاتەکەیان دابەش کرد و سنووریان لەنێوان بەشەکاندا دامەزراند، هەر ئەوانیش بوون و ئەوانیشن سنووریان خستۆتە نێوان دیالێکت و ڕێنووس و ڕێزمان و ئەلفوبێیەکەمانەوە و ئەمڕۆیش دەیانەوێ بە زۆر بیسەپێنن.

ئەمڕۆ هەندێ کەس لەبەر نەزانی و چاوبەستراوی بە دڵگەرمییەوە پشتگیری لە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی دەکەن. من دڵنیام بەشێکی زۆری ئەمانە لە ڕووی دڵسۆزییەوە و وەک پەرۆشێک بۆ باری نالەباری فەرهەنگ و زمانی کوردی وا بیر دەکەنەوە، بەڵام دڵنیایشم زۆربەیان بە ڕووالەت هەڵخەڵەتاون و لە گرنگی و ئەندازەی ڕاستەقینەی باسەکە ئاگادار نین. زۆر ڕووناکبیر و نووسەری گەورەی کورد ئێستایش لە بایەخ و ناسکیی ئەم باسە نەگەیشتوون.

## دوو: سیاسەتی ئیمپەریالیستی

من پەیدابوونی ئەلفوبێی لاتینی لەناو کورددا جیا ناکەمەوە لەو هەلومەرجە سیاسییەی لە سالانی دابەشبوونی کوردستان و شەڕی دووەمی گیتیدا سەردەست بوو. دەبوو کوردستان دابەش بکرێت و لەناو ئەو دەولەتە تازانەدا پارچەپارچە بکرێت. دەبوو کێشەیەک لەو ناوەڕاستەدا بهێلرێتەوە بۆ ئەوەی هەمیشە وەک بۆمبێک ئامادە بێت بۆ تەقینەوە. دەبوو جێدەستێک بهێلرێتەوە بۆ ئەوەی ڕۆژاوا، هەر کاتێ پێویستی پێ بوو، دەستی بۆ ببات و بە کاری بهێنێت. دەبوو کوردیش بە جۆرێک دابەش بکرێت کە ڕۆژێ لە ڕۆژان نەبێتە هێزێکی یەکگرتووی وەها کە زیانی هەبێت و ببێتە مەترسییەک بۆ ڕۆژاوا و ئیمپەریالیستان، نەبێتە ئەو دێوەی جادووگەرێک ئامادەی دەکات و دواتر دەبێتە بەلا بەسەر خۆیەوە و سەری خۆیشی دەخوات. دەبوو دینامیزمێک دروست بکرێت، بتوانرێت کوردی پێ بکرێت بە گژ یەکتردا، وەک چۆن لای نەتەوەکانی دیکەیش ڕووی داوە، تا نەتوانێ هەرگیز یەک بگرێت، دینامیزمی فەرهەنگی و سیاسی. ئەمڕۆیش خەلکێکی زۆر هەن کە بە ژاراوی دەستگای ڕاگەیاندنی ئیمپەریالیستەکان مێشکیان شۆراوەتەوە و پێیان وایە هەر شتێک هەنگاوێک لە ئەورووپا و لە ئەمەریکاوە نێزیکیان بخاتەوە، دەبێتە هۆی پێشکەوتن و سەربەخۆیی و ئازادیی کورد و نیشتمانەکەی. ڕۆژاواپەرستی مۆدەیەکی دلگیرە و مرۆڤی لاواز زوو فریو دەدات و خەلک بە ئاسانی شوێنی دەکەون. ڕۆژاوا دەتوانێ ملیۆنان دۆلار خەرج بکات و دەیان دەستگات بۆ دامەزرێنێ، بەو ناوەوە کە گوایە خزمەتی فەرهەنگ و زمانی کوردی دەکات، بەلام هەموویشیان دەکاتە پەردەیەک بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە و نیازە ئیمپەریالیستانەکانی خۆی.

دەرچوونی گۆڤاری هاوار (١٩٣٢-١٩٤٣) و گۆڤارەکانی دیکە لە شام و بەیرووت لە سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەمدا سەرەتای پیادەکردنی نەخشەی هەلوەشاندنەوەی یەکێتیی زمان و فەرهەنگی کوردی بوو. ڕەنگە هەندێ لەوانەی لە سەرەتادا کاریان تێدا دەکرد،

پێیان وا بوو‌بێت بەم کارە خزمەتی ئەدەب و زمانی کوردی دەکەن و گوایە، بەپێی بیرکردنەوەی خۆیان، سوودێک لە فرانسییەکان دەبینن، کە لە کاتی شەڕی دووەمی گێتیگردا دەیانویست دەنگی کوردیش دژی بەرەی نازیزم بە کار بێنن. بەڵام ناکرێ هەموویان هێندە خۆشباوەڕ بووبێتن، بەتایبەت باوەڕ ناکەم بەدرخانییەکان، کەسانێکی وەک جەلادەت و کامران، ئەوەندە ناشارەزا و ناهۆشیار بووبێتن کە نەیانزانیبێت کۆلۆنیالیستانی فرانسی بۆچی پشتیان دەگرن و، ئەو ئەلفوبێ لاتینییە بە چ نیازێک پێشکەش دەکرێ و پەرەی پێ دەدرێت. ئەوان زۆر لەوەپێش پێوەندییەکی دۆستانەیانان لەگەڵ کۆلۆنیالیستانی ئینگلیز و فرانسی و دەستەودایەرەیاندا (تەنانەت لەگەڵ بەشی زانیاری و پۆلیسی نهێنیدا) هەبووە و لێیانەوە نزیک بوون. بەڵام هۆی ڕازیبوونیان بەم نەخشە گوماناوییە ناحەزانەیە ئەوە بوو، دەیانویست ئەوەی لە مەیدانی سیاسەتدا دۆڕاندبوویان، لە ڕێگەیەکی دیکەوە دەستیان بکەوێتەوە. بەدرخانییانیش ئەم کارەیان نەکردایە، کۆلۆنیالیستانی ئەوروپایی خەڵکێکی دیکەیان هەر بە کار دەهێنا و نەخشەکانی خۆیانیان پێ دەبردە پێشەوە.

## سێ: لاتینی کرۆکی بیری کەمالیزمە

زمانی کوردی یەک ڕێگەی لە بەردەمدایە بۆ خۆپاراستن و مانەوە، ئەویش ئەوەیە کە هەموو کورد بە یەک ئەلفوبێ بنووسێت و ئەو ئەلفوبێیەیش دەبێ ئەلفوبێی کوردی بێت (ئەلفوبێی گونجێنراو- یا هەموارکراوی فارسی عەرەبی، کە بە ناڕەوا و لەبەر مەبەستێکی تەڵەکەبازانەی سیاسی هەر بە ئەلفوبێی عەرەبی ناو دەبرێت). دەنا نە ئەلفوبێی لاتینی و نە ئەلفوبێی کریلیک (ئەمیان ئێستا بەرەو نەمان دەچێت) ناتوانێ هیچ بۆ کورد و بۆ فەرهەنگ و زمانەکەی بکات و، بگرە دەبێتە هۆی ڕووخاندن و تێکشکاندنی ئەو هێندەیش کە لە ماوەی هەزارساڵی ڕابوردوودا بنیاتمان ناوە. ئەلفوبێی لاتینی هەر لە بنەڕەتیشدا بەو نیازە هێنراوەتە ناو کوردەوە. بایەخ و گرنگیی ئەلفوبێی کوردی هەر ئەوە نییە کە جوانە، یا بۆ نووسینی دەنگەکان

لەبارترە، بەڵکە ئەوەیشە کە دوای سەدان ساڵ بەکارهێنانی بۆتە گەنجینەی پاراستنی ئاوەز و بیر و هۆش و فەرهەنگ و شارستانەتیی کورد. هەروەک ئەو داوە زێڕینەیشە کە فەرهەنگی کورد و فەرهەنگی بەشی هەرە زۆری گەلانی ڕۆژهەڵات پێکەوە گرێ دەدات و لە مەودایەکی مێژوویی و فکری و شارستانەتیدا دەیانکاتە یەکەیەکی مەعنەوی و سیاسی. هەر بڕیار و هەر گۆڕانێک کە بیەوێ ئەلفوبێی لاتینی بەسەر زمانی کوردیدا بسەپێنێ دوژمنایەتیکردنی ئاشکرای یەکێتیی کورد و فەرهەنگ و زمانەکەیەتی و زۆر بە ڕاشکاوی دەیڵێم خیانەتێکە بەرانبەر کورد. ئەگەر بە ڕێژەیش وەریبگرین، ئەوەی بە ئەلفوبێی کوردی دەنووسرێت لەگەڵ ئەوەدا کە بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسرێت، بەراورد ناکرێت، نە لە ڕووی چەندایەتی و نە لە ڕووی چۆنایەتییەوە. ئەمڕۆ ئەوەی بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسرێت ناگاتە ١٥% (پانزدە لە سەددا)ی سەرجەمی نووسینی کوردی. ئاسانترین ڕێگە ئەوەیە کوردی باکوور بگەڕێنەوە سەر بەکارهێنانی ئەلفوبێی کوردی و خۆیان لە ئەلفوبێی تورکی ڕزگار بکەن. هەنگاوێکی وەها لە ڕووی سیاسیشەوە بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە.

هەندێ کەس پێیان وایە ئەلفوبێی ئێستای کوردی گیروگرفتێکی زۆری هەیە و بە گۆڕینی نەبێت چار ناکرێت. لەوانەیە ئەلفوبێیەکە هەندێ ناتەواویی بچووکی تێدا هەبێت، بەڵام نە ناتەواوییەکان ئەوەندە گەورەن کە چارەسەر نەکرێن و نە چارەسەریش بەوە دەکرێت کە بە جێی بهێڵین و وازی لێ بهێنین و دەست بە ئەلفوبێیەکی تازە بکەین، لە کاتێکدا سوور دەزانین ئەو ئەلفوبێ تازەیە، ئەگەر مەبەست لاتینییەکە بێت، هەر لەگەڵ هاتنیدا و لەگەڵ لەدایکبوونیدا دەیان گیروگرفت و ناتەواویی گەورەتری تێدایە، ئەگەر باسی لایەنە فۆنەتیکییەکەی بکەین. خۆ ئەگەر لە ڕووی دیکەوە بیری لێ بکەینەوە، ئەوا تێ دەگەین کە ئەلفوبێیەکە بەو ئامانجە هێنراوەتە ناو کوردەوە کە مێشکی نەتەوەیەک بشۆرێتەوە و لە ڕابوردووی خۆی دووری بخاتەوە و بیکاتە دارێکی زڕی بێڕەگوڕیشە و پارچەپارچەی بکات. بەکارهێنانی حەرفی لاتینی بۆ نووسینی کوردی لاساییکردنەوەیەکی

تورکەکان بوو کە بە نیازی دوورخستنەوەی تورکیا لە ڕۆژهەڵات ئەلفوبێی خۆیانیان گۆڕی و لە هەموو شتێکدا دەستیان کرد بە لاساییکردنەوەی ئەورووپا و، بەوەیش بوون بە گەلێکی بێفەرهەنگ. میلان کوندێرا Milan Kundera (١٩٢٩ لە دایک بووە) لەم ڕووەوە قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: "یەکەم هەنگاو بۆ لەناوبردنی نەتەوەیەک سڕینەوەی بیریەتی(یادەوەری). دەبێ کتێبەکانی، فەرهەنگەکەی و مێژووەکەی لەناو ببرێت، دوایی دەبێ کەسێک هەبێ کتێبی تازە بنووسێت، فەرهەنگێکی تازە بە درۆ دروست بکات، مێژوویەکی تازە بنووسێت. دوای ماوەیەکی کورت نەتەوە ئەوەی لە بیر دەچێتەوە کە هەیە و کە هەبووە. دنیای دەوروبەریش هەموو شتێکی تەنانەت خێراتریش لە بیر دەچێتەوە."

ترکزە(خەتەر)ی ئەلفوبێی لاتینی هەر ئەوە نییە کە ڕەنگە خوێنەری بەشێکی کوردستان نەتوانێت تێکست و بەرهەمەکانی بەشێکی دیکە بخوێنێتەوە، کە ئەمەیش مەترسییەکی کەم نییە، بەڵکە ئەوەیشە کە بیرکردنەوە و مێشکێکی دیکەی جیاواز دێنێتە کایەوە و فەرهەنگێک دەچەسپێنێ کە بە تەواوی لە فەرهەنگی هەزارساڵەی کورد جیاوازە و لە ڕابوردوویەک دایدەبڕێت کە کۆڵەکەی مانەوە و یەکێتیی نەتەوە و دینامیزمی پێشکەوتن و گەشەکردنی بووە. ڕەنگدانەوەی ئەم بارە فەرهەنگی و سایکۆلۆگییە بە ئاشکرا لای بەشێکی یەکجار زۆری ڕووناکبیر و سیاسەتمەدارانی کوردستانی تورکیا دەردەکەوێت. ئێستا نەوەیەک دروست بووە کە هەر بە تورکی خوێندوویەتی، ئەگەر زمانەکەی خۆیشی خوێندبێت، ئەوا بە ئەلفوبێی لاتینی خوێندوویەتی و لەبەر ئەوە فێری بەسەر ئەدەب و فەرهەنگ و مێژووی کوردستانەوە نییە و هیچی لێ نازانێ. ئەمە هەر وا ڕێکەوت نییە کە خوێنەوارێکی کوردی تورکیا زۆر بێپەروا دەتوانێ بڵێت، من زمانی کوردیم داهێناوە، منم یەکەم جار ڕۆمانم بە کوردی نووسیوە، کەس پێش من کتێبی منداڵانی بە کوردی نەنووسیوە، پێش من کەس شانۆنامەی بە کوردی نەنووسیوە. مێژووی تازەی ئەدەبی کوردی لە منەوە دەست پێ دەکات، کەس پێش ئێمە کوردایەتیی نەکردووە، سەرکردەکانی

پێشتر هەموو ئاغا و شێخ و مەلا و فیۆدال بوون، ئێمەین کە گەلی کوردمان هۆشیار کردۆتەوە و، سەدان قسەی نەزانانە و گەوجانەی لەم بابەتە. ڕووناکبیرانی کوردستانی تورکیا باسی خراپە و مەترسیی سیاسەت و ئیدیۆلۆگیی کەمالیزم دەکەن، بەڵام لەوە نەگەیشتوون کە دڵسۆزترین شاگرد و قوتابیی کەمالیزم و دڵگەرمترین برەوپێدەری کەمالیزم خۆیانن. بەڕاستی من پێم وا نییە لە کوردستانی تورکیادا ڕووناکبیری کورد هەبێت، مەگەر بە ڕیزپەڕ چەند دانەیەک هەبن، خۆیانیان پێ گەیاندبێت. ئەو ڕووناکبیرانەی خەڵکی کوردستانی تورکیان، ڕووناکبیری تورکن، نەک کورد. ئەوان ڕەنگە ڕووناکبیری گەورەیشیان تێدا هەڵکەوتبێت و هەڵبکەوێت، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کە ڕووناکبیری کورد نین، چونکە مێشک و بیرکردنەوە و کۆدەکانی سیستێمی بیرکردنەوەیان بە تورکی داڕێژراوە.

هیچ گەلێکی خاوەن فەرهەنگ و شارستانەتی نایێت بە دەستی خۆی ئاگر بەر بداتەماڵەکەی خۆی و ئەوەی لە هەزاران ساڵدا بنیاتی ناوە، هەمووی هەڵوەشێنێتەوە و هەڵتەکێنێ. زۆر گەلی دیکە هەن کە ئەلفوبێی تایبەتی خۆیان بە کار دەهێنن و لەوەیە لە هەندێ ڕوویشەوە گیروگرفت لە ئەلفوبێکەیاندا هەبێت، بەڵام دیسان بە شانازییەوە بە کاری دەبەن، بۆ نموونە جوولەکە، چین، عەرەب، هیندستان، ئێران، ئەرمەن، ئاسووری، ئەریتریا، حەبەشە، بەنگلادێش، گورجستان، ژاپۆن، کۆریا و زۆری دیکەیش. خوێنەرێک یا ڕووناکبیرێکی کوردستانی باکوور کە ئەمڕۆ تەنیا بە ئەلفوبێی لاتینی ڕاهاتووە و شتێک بەو ئەلفوبێیە نەنووسرابێت ناتوانێت بیخوێنێتەوە، نەک هەر خۆی لە بەشی هەرە زۆر و فراوان و گرنگی ئەدەبی کوردی بێبەش دەکات، ئەو ئەدەبەی بە کوردیی خوارووی نووسراوە، بەڵکە لە بەشی هەرە گەورەی ئەدەبی کرمانجییش بێبەشە؛ ئەو ئەدەبەی لە بادینانی کوردستانی عیراق دەنووسرێت. لەوەیش بەولاوە لە هەموو کلاسیکی ئەدەبی کوردی بێبەش بووە. تەنانەت ئەو کەمە تێکستەی کلاسیکی کرمانجییش کە خراوەتە سەر تیپی لاتینی دادی نادات، چونکە لە تیپە لاتینییەکاندا وێنەی هەموو دەنگەکان نییە و

ئەوەیش دەبێتە هۆی شێواندنی تێکستە کلاسیکییەکان. لەوەیش بترازێ، کەسێک کە تەنیا ئەو ئەلفوبێ لاتینییە بناسێت ناتوانێت لە نرخە هونەرییەکانی کلاسیک بگات. هەر بۆ نموونە دەڵێم، کە شاعیرێکی کلاسیک باسی (ئەلفی قەد) دەکات، کەسێکی شارەزای کلاسیک یەکسەر تێدەگات مەبەست ئەوەیە بەژنی یار وەک تیپی (ئەلف: ا) ڕاست و ڕێکە. یا کاتێ چاوی یار دەچوێنێتە تیپی (عەین: ع)، ئەمە لە لایەکەوە لەبەر ئەوەی شێوەی تیپەکە لە چاو دەچێت و لە لایەکی دیکەیشەوە لەبەر ئەوەی (عەین) بە عەرەبی واتە (چاو). بەڵام کەسێک ئەو ئەلفوبێ کوردی-عەرەبییە نەناسێت، ناتوانێت ئەم تایبەتییە هونەری و ئێستێتیکییە تێبگات.

لەمساڵانەدا ڕۆمانێکی نووسەری دیاری تورک ئۆرهان پاموکم دەخوێندەوە کە ناوی (من نێوم سوورە) بوو. من ڕۆمانەکەم بە ئینگلیزی خوێندەوە، چونکە تورکی نازانم. ئەگەرچی پاموک شارەزاییەکی باشی لە فەرهەنگی کلاسیکی تورک و ڕۆژهەڵاتدا هەیە، کەچی لەبەر ئەوەی خۆی بە تورکیی نوێ، ئەو تورکییەی بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسرێت، خوێندوویەتی، کەوتووەتە هێندێ هەڵەی هونەرییەوە کە خۆی لێیان بێئاگایە. لە جێگەیەکدا پاڵەوانەکە باسی تاڵەموویەکی قژی خۆشەویستەکەی دەکات کە بەسەر سەرینەکەوە بە جێ ماوە، دەڵێ تاڵەمووەکە بە جۆرێک خوار بووبووەوە دەتگوت حەرفی عەین (ع)ی عەرەبییە. چوارسەد ساڵ پێش ئێستا، عاشقێکی کۆلکە خوێندەواری دانیشتووی ئەستەنبووڵی عوسمانی ناکرێ بیری لەوە کردبێتەوە کە ئەلفوبێی دیکەیش هەیە(هەبووبێت)، بۆیە ئەوەی جەخت کردبێت کە داوە مووەکە لە تیپی عەینی عەرەبی چووە. ئەو دەبوو تەنیا بیگوتایە تاڵەمووەکە لە حەرفی عەین دەچوو. ئەوەی کە لە ڕۆمانەکەدا باسی حەرفی عەینی (عەرەبی) دەکات، ئۆرهان پاموکی ڕۆماننووس خۆیەتی نەک پاڵەوانەکە.

شێواندنی دەنگ و فۆنیمەکانیش یەکێکە لە لایەنە هەرە گاڵتەجاڕەکانی ئەلفوبێی لاتینی. لەو ئەلفوبێیەدا هیچ نیشانەیەک بۆ دەنگەکانی (ئ ح، ع، غ، ڵ، ڕ، وێ) دانەنراوە. بەو بیانووەوە کە هەندێکیان دەنگی

عەرەبین (!!). تۆ هەر بەرهەمێکی کلاسیک و تازەی ئەدەبی کوردی بگری بە دەستەوە، سەدان جار ئەم دەنگانەت بەرچاو دەکەوێت. ئیدی چۆن دەتوانیت هەروا سووک و ئاسان لە زمان دەریانبهێنی و فڕێیان بدەیت؟ ئەمە تەنیا عەقڵێکی فاناتیکی ڕاستینەناس دەتوانێ ئاوا بیر بکاتەوە. لە مەموزیندا زۆر جار هونەری خانی لەوددایە قافییەی بەیتەکان بە جۆرێک دادەنێت کە لە یەکدی بچن و تەنیا لە حەرفێکدا جیاواز بن (پێم وایە بەم جۆرە وشانە دەگوترێت هۆمۆنایم Homonym). بۆ نموونە (موهەبیا، موحەبیا)، (نەصل، نەسل)، (مەئموور، مەعموور)، (عاجیل، ئاجیل). کە ئەمانە دەخرێنە سەر ئەلفوبێی لاتینی شتێکی پێکەنینهێنیان لێ دەردەچێت. ئەگەر بە وردی بیر لە بەڵگە و بیانووە نازانستییەکان بکەینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بیرێکی ڕەگەزپەرستانە لەپشت ئەلفوبێی لاتینییەوەیە؛ بیری دژایەتیی هەموو فەرهەنگ و شارستانەتیی عەرەب و کورد و ئێران و ئیسلام و ڕۆژهەڵات. کە لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابوردوودا مستەفا کەمال (ئەتاتورک) ئەلفوبێی لاتینیی بەسەر نەتەوەی تورکدا سەپاند و زۆر شتی ڕواڵەتانەی ئەورووپای وەرگرت، لە بیرێکی ڕەگەزپەرستانەوە بۆی دەچوو. هەشتا ساڵ دوای دروستبوونی تورکیای "تازە و مۆدێرن و ئەورووپایی"، گەلانی تورکیا، بە کوردیشەوە، زۆر ڕووی شارستانەتی و نرخ و فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتییان لە دەست چوو، بەڵام نەبوون بە ئەورووپایی... و ناشبن.

## چوار: دوو ڕاستی

کە باسی قەیرانی زمانی کوردی دەکرێت، دوو ڕاستیی زۆر گرنگ دەکرێن بە ژێر لێوەوە و لە گەرمەی باسەکاندا بێسەروشوێن دەکرێن: یەکەمیان ئەوەیە کە کوردیی خواروو زمانێکی ستانداردە و بە هەموو پێوەرێکی زانستی و زمانەوانی ساڵانێکە ڕۆڵی زمانێکی ئەدەبیی ستانداردی هەیە (یەک شێوە، خوێندن، دەستگاکانی ڕاگەیاندن، کارگێڕی...هتد) و دووەمیش: ئەو گیروگرفت و ناتەواوی و فرەیی و جیاوازییەی لەبارەی ئەلفوبێوە باس دەکرێ، تەنیا پێوەندی بە کوردیی

سەرووەوە هەیە (کورمانجی). تەنیا کرمانجییە بە سێ (یا چوار) ئەلفوبێ نووسراوە و دەنووسرێت، دەنا کوردیی خواروو ئەلفوبێی دامەزراوی خۆی هەیە. ئەگەر ئەو ئەلفوبێ کوردییە لەگەڵ ئەلفوبێ و ڕێنووسی ئەو زمانانەدا کە ئەلفوبێی گونجێنراوی فارسی-عەرەبی بە کار دەهێنن، بەراورد بکەین، دەبینین کورد لە هەموویان زیاتر و چاکتر توانیویەتی ئەلفوبێیەکە لەگەڵ سیستێمی فۆنیمەکانی زمانەکەدا بگونجێنێ و دەنگەکان بپارێزێت و نیشانەی نوێنەری دەنگەکان دابنێت. هیچ نەتەوەیەک لەو نەتەوانەی بە ئەلفوبێی عەرەبی (ئارامی، فارسی) یا ئەلفوبێی هەموارکراوی عەرەبی فارسی دەنووسن هێندەی کورد بە ڕێکوپێکی نەیتوانیوە بزوێنەکان (ڤاول، ڤۆکال، دەنگدار) بە نووسین، بە دانانی تیپی تایبەت دەرببڕێت.

# زمان له پەنجەرەی ئێستێتیکەوە

زۆرم حەز دەکرد بمتوانیبایە ئەم باسەم هەر لە چوارچێوەیەکی تیۆریدا بهێشتایەتەوە و ناچار نەبوومایە لەگەڵ کێشە دزێوەکانی بەکارهێنانی ڕۆژانەی زمانی کوردیدا ڕووبەڕوو ببمەوە. کە دەڵێم دزێو مەبەستم ئەو بارە ناڕاست و ناساغەیە کە زمانی کوردیی تێ کەوتووە، بە هۆی بەکارهێنانێکەوە کە نە لە گەوهەری زمان دەگات، نە نرخە ئێستێتیکییەکانی دەناسێتەوە و نە شارەزای مێکانیزمی ژیان و گەشەکردنی زمانە.

تا ئێستا، هێندەی من ئاگادار بم، کەس نەهاتووە مێژووی گەشەکردن و پێشکەوتنی زمانی کوردی بنووسێت، یا لێی بکۆڵێتەوە. لایەنێکی گرنگی ئەو مێژووە، بە لای منەوە، مێژووی وشەی کوردییە، بە تایبەتیش لەو ڕووەوە کە وشەی کوردی چۆن توانیویەتی ببێتە گەنجینەیەکی ئێستێتیکیی بیر و هۆش و خەیاڵی مرۆڤی کورد. لێکۆڵەرەوە لەم بوارەدا ناتوانێت هەر لە خۆیەوە تاکە تاکەی وشە بگرێت و بە ڕەگ و ڕەچەڵەکیاندا بچێتە خوارێ، چونکە مێژووی وشەیش، ڕێک وەک مێژووی سیاسی و مێژووی زۆر دیاردەی دیکەیش، دەبێ لەسەر بنچینەی کەرەستەیەکی دیاریکراوی بەردەست هەڵچنرێت. لێرەدا کەرەستەکە ئەو چوارچێوە و دەفر و قاڵبانەیە کە وشەیان تێدا هەڵگیراوە و نەوە لە دوای نەوە پارێزراون، واتە دەق، تێکست، کە دەکرێت بە دوو بەشەوە: نەریتی فۆلکلۆری و ئەدەبی نووسراو.

ئەم جیاکردنەوەیە پێوەندیی بە جۆری پەیدابوون و گەشەکردنی ئەو تێکستانەوە هەیە، نەک لە ڕووی چاکی و گرنگییەوە یا پلەبۆدانانیان. لە ئەدەبی نووسراودا، دیارە، جێدەستی هونەرمەند ڕوونتر دەکەوێتە بەر چاو و دەکرێت لە شێوەی بیرکردنەوە و هەڵوەستی بەرانبەر وشە و نرخی وشە باشتر بکۆڵرێتەوە. بەڵام فۆلکلۆر هەتا نەنووسرێتەوە، گۆڕانی زۆری بەسەردا دێت. بێجگە لەوەیش داهێنەر بە گومناوی دەمێنێتەوە. ئەو تیۆرییە مارکسیستییەی کە ئافراندنی فۆلکلۆر

دەگەڕێنێتەوە بۆ جەماوەر و گەل و، فۆلکلۆر بە بەرهەمێکی هەرەوەزی دادەنێت، بەرانبەر بەشی هەرە زۆری تێکستە فۆلکلۆرییەکان کورت دێنێت و بە ڕاست دەرناچێت. کەمجار تێکستێکی فۆلکلۆری دەبینین کە ئاخێوەر تێیدا کۆ بێت و بە ناوی گرۆیەکەوە قسە بکات. دەربڕینی هەستی وردی تاکەکەس ناکرێت بە کۆمەڵ ئەنجام بدرێت. کۆمەڵەپیاوێک ناتوانن پێکەوە حەز لە ژنێک بکەن و پێکیشەوە گۆرانییەک یا شیعرێکی یەکگرتووی بۆ دابنێن و هەستی ناسکی خۆشەویستیی تێدا دەربڕن. ئەمە لە بەرهەمێکی سیاسیی تازەدا دەشێ ڕوو بدات (ئێمەی کرێکار، ئێمەی قوتابی...)، بەڵام ئاخێوەرێک کە "پێی حەیفە باڵای ژنەکەی هاوسێی شەو بە تەنیا بێت"، یا تەنانەت ئەگەر "دایکی حەوت کوڕیش بێت هەر بە تەمایەتی"، ئەمە ئیدی ناکرێ نوێنەری هەموو گەل یا هەموو خێڵ بێت.

زمان تا ڕادەیەکی زۆر، نیشاندەری پلەی شارستانەتییە. پلە جیاوازەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵ، زمان بەو بارەدا دەگۆڕن کە وەرامدەرەوەی پێویستییە ماددی و ڕۆحییەکانی ئاخێوەران و بەکارهێنەکانی زمانەکە بێت. ئەمە لەو هەموو وشە و زاراوانەدا دەردەکەوێت کە ڕۆژانە و ساڵانە دەڕژێنە ناو زەریای زمانەوە، بەتایبەت ئەگەر زمانەکە چالاک و زیندوو بێت. پێشکەوتنی خێرای تەکنیک لە ٢٠-٢٥ ساڵی ڕابوردوودا بە جۆرێ تەنگی بە زمانانی دنیا هەڵچنیوە کە کەمجار ڕێک دەکەوێت زمانێک خۆی لە بەردەم شالاویدا ڕابگرێت، یا پێ بە پێی بڕوات. (فاکس) لە زمانی ئینگلیزی و هەندێ زمانی دیکەیشدا وەک ناویش و وەک کرداریش بە کار دەبرێت. لە فارسیدا زۆرتر هەر فاکس بە کار دەبەن، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا بینیومە وشەی (دورنویس) هاتۆتە کایەوە، کە بە کوردی دەبێتە (دوورنووس). ئەم وشەیە نە بە فارسی و نە بە کوردی وەک کردار گەردان ناکرێت. من هەندێ جار بۆ گاڵتە بە دۆستەکانم دەڵێم (بیفاکسێنە، فاکساندم...).

لە پلەی تاکەکەسیشدا زمان ئاوێنەی وێنەنوێنی پلەی هۆش و ڕادەی بیرکردنەوەیە. زۆر هەست و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی مرۆڤانە

هەن کە ئەگەر وشەی لەبار و پڕبەپێستیان بۆ بە کار نەهێنین، لە ناوەڕۆکیان دادەشکێت و مافی تەواوی خۆیان نادەینێ. لە کوردیدا وشەی (شەرم، شەرمکردن) بۆ دوو هەستی جیاوازی ئینسانی دەخرێتە کار. لە ئینگلیزیدا (Shame, ashamed) بۆ هەستێکە کە وا بزانیت هەڵە یا تاوانت کردووە، بەڵام (Shy) هەستێکی دیکەیە؛ ناتوانیت، ناوێریت شتێک بکەیت یا بڵێیت. بۆ ئەمەیان لە کوردیدا هەندێ جار (لەڕوونەهاتن) بە کار دەبرێت نەک شەرم؛ ئاخر منداڵێکی ئێسکسووک نەتوانێت خۆی پێشانی کەسێکی گەورە بدات و دزێک کە نەیەوێت خۆی پێشانی تەماشاکەرانی دادگا بدات دوو شتی جیاوازن. ئەگەر بە کەسێک بڵێین (درێژ)، ئەگەرچی ڕاستییەکی فیزیکیمان دەربڕیوە، بەڵام هەستێکی نەنرخاندن، یا بەرزنەنرخاندنیشمان ڕاگەیاندووە، کەچی کاتێ بتەوێت هەستی جوانهەڵسەگاندن و بەرزنرخاندن دەرببڕیت، دەڵێیت (باڵابەرز). هەر بەم پێیەیش (ملدرێژ) و (گەردنبەرز) دوو هەڵوەستی جیاوازی نرخاندن ڕادەگەیێنن. لەم بارەیەوە دەکرێت لیستێکی دووړودرێژ دابنێین.

شاعیرانی داهێنەر و بیرتیژ، وشە وەک ئافەریدەیەکی ساکار و یەکتوێژە تەماشا ناکەن، بەڵکە کۆمەڵێ توێژی جیاوازی تێدا دەبینن و لە پلەی جیاوازدا بە کاری دەبەن. ڕاستییەکەی ئەمە هونەرمەندە، شاعیر و نووسەری داهێنەرە کە ئەم توێژانە دروست دەکات، یا دەیانخاتە گەڕ. دەنا وشە بدەیتە دەست کەسێکی بێبەهرەوە، وەک ئەوەیە زێڕ بدەیتە دەست شێتێکەوە، یا کۆمپوتەر بدەیتە دەست وەرزێرێکی ئەفغانی، کورد یا سۆمالییەوە. ت. س. ئیلیۆت دەڵێ: "کاتێ کە شاعیری گەورە شاعیرێکی گەورەی کلاسیکیشە، نەک تەنیا فۆرمێک، شێوەیەک، بەڵکە زمانی سەردەمەکەی خۆیشی چۆڕبڕ دەکات؛ زمانی سەردەمەکەیشی، بەو شێوەیەی ئەو بە کاری هێناوە، دەبێتە شێوەی کاملبووی زمان."

لە ئەدەبی کوردیدا کەس ئەوەندەی مەلای جەزیری، ئەحمەدی خانی، مەولەوی و نالی لە نهێنی زمان و وشە و بەکارهێنانی هونەرمەندانە نەگەیشتووە و بە کردەوە تێگەیشتنەکەی خۆی لە قالبێکی

سەرکەوتوودا پیشان نەداوە. جەزیری و خانی و مەولەوی بێجگە لە تێگەیشتنی سیمانتیکی وشەی کوردی و عەرەبی و فارسی، توێژێکی دیکەیان خستووەتە سەر بارستاییی وشە، کە لە چێژی سۆفییانەی خۆیانەوە هەڵیانهێنجاوە. ئەوان ئەگەرچی نوختەی دەرچوونیان فەرهەنگی زاراوەی سۆفییەکانە، بەڵام ئەزموونی خۆیشیان، ڕۆحی و ژیاری، ئەم هەستیارییەی (هەستەوەرییەی) لا بەهێز کردوون. نالی خۆی بە فەرهەنگی زاراوەی سۆفییانەوە خەریک نەکردووە، تەنانەت ئەو جارە کەمانەیش کە لە دین نزیک بووەتەوە، پەنای بردووەتە بەر فەرهەنگی شەریعەت، دینی ڕۆژانە، فەرهەنگی زانایان، بۆ نموونە زمانزانان، نەک سۆفییەکان. بەڵام ئەزموونی ژیاری و فکریی خۆی، چ ئەوەی لە فەرهەنگی بیریارانەوە دەستی کەوتبێت و چ ئەوەی خۆی پێی گەیشتبێت، هێندە سەرشار و دەوڵەمەند بووە، کردوویەتی بەو جادووگەرەی وشەی هێناوەتە سەما. یەکێک بڕێک شارەزای ئەدەبی کلاسیکی عەرەبی بێت دەزانێت هەڵوێستی نالی بەرامبەر زمانەکەی خۆی، ڕێک دەڵێی هەڵوێستی موتەنەببی (المتنبی)ی شاعیری گەورەی عەرەبە (٩١٥-٩٦٥) بەرانبەر زمانی عەرەبی، ئەگەرچی هیچ بەڵگەیەکیشمان بە دەستەوە نییە پێمان بڵێ نالی چەند ئاشنای شیعری موتەنەببی بووە.

گۆران وشەی جوان و ژیکەڵە و لەباری زۆر بە کار هێناوە، وشەی یەکجار ناسک و نەرم و بۆندار، بەڵام بە دەگمەن وێنەیەک لە شیعرەکانیدا دەبینیت کە دوو لێکدانەوەی جیاواز هەڵگرێت، یا چەندلۆیی بێت. وا پێ ناچێت سەروسەودایەکی لەگەڵ فکر و فەلسەفەدا هەبووبێت. گۆران لە پلەی یەکەمدا لەگەڵ سیمانتیکی وشەدا خەریک بووە و وشەی بۆ دەربڕینی پێنج هەستەکە خستۆتە گەڕ. ناوەڕۆکی شیعری گۆران (خۆشەویستی، سروشت، جوانی و خەباتی سیاسی) کەمتر پێویستی بە مەودایەکی دەروونی هەبووە. ئەو زمانە شیعرییەی گۆران هێنایە ئاراوە شۆڕشێک بوو لە شێوەی دەربڕیندا لەو ڕووەوە کە زمانی کوردیی لە چنگی زانا و سۆفییەکان دەرهێنا و کردی بە دیارییەک بۆ خوێنەواری ئاسایی کورد. بێکەس و قانیع و

هێمن و هەژار و جگەرخوێن بە چاوی جووتیارێک، بە چاوی گوندییەک تەماشای زمان دەکەن (هێمن لە شیعری نالەی جودایی و یەک دوو شیعری دیکەدا زمانەکەی جیاوازە). لەناو پەخشاننووسانی کورددا کەسێک نابینم لە ڕووی زمانەوە هێندەی مەلا مەحموودی بایەزیدی، عەلائوددین سەججادی و مەسعوود محەمەد وردبین و وریا و هەستیار بێت. ئەم وردبینییە لە هەڵبژاردنی وشەدا به کار هێنراوە، دەنا کەسیان بە تەواوی پابەندی سینتاکسی زمانی کوردی نییە. من لەم هەڵسەنگاندنەدا تەنیا بیرم لە لایەنە هەرە گەش و باڵاکانی بەرهەمەکانیان کردووەتەوە، دەنا هەر هەموویان، لە جەزیرییەوە بگرە تا دەگاتە سەججادی، لایەنی وا لاواز و بێهێزیشیان هەیە، دەڵێی لە کاتی دانان و نووسینیدا پەنجەرەی چێژی ئێستێتیکییان پێوە داوە.

لە هیچ جێیەکی ئەدەبی کوردیدا شتێکمان بەرچاو ناکەوێت تێمان بگەیێنێت شاعیر چۆن بیری لە زمان کردووەتەوە، یا هەر نەبێ ئەوە ڕوون بکاتەوە مێکانیزمی نووسینی چۆن بووە. خانی لە دوا دێڕەکانی مەم و زیندا زۆر بە کورتی و لە ڕوانگەیەکی دینییەوە باسی تەکنیکی نووسین دەکات. لەم ڕووەوە ئەدەبی عەرەبی و فارسی زۆر دەوڵەمەندن. مەولانا جەلالوددینی ڕوومی دەفەرموێ:

لفظ چون وکرست و معنی طایرست

جسم جوی و روح آب سایرست

ئەمە بناخەی تێگەیشتنێکە کە سەدان ساڵ لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوایش باو بووە و ئەمڕۆیش ئەگەرچی تیۆرییەکانی زمان دەیخەنە بەردەم پرسیار، بەڵام ناتوانن هەروا بە ئاسانی بیدەنە دواوە. بەپێی ئەم تێگەیشتنە وشە تەنیا قاڵب، دەفر، چوارچێوەیەکە بۆ حەواندنەوەی مەعنا. هەر مەولانا خۆی و دەیان داهێنەری دیکەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوایش بە شێوەی نووسین و دەربڕینیان بە جۆرێک لە وشە و لە زمان نزیک بوونەتەوە، کە لەگەڵ بنەمای ڕوواڵەتیی ئەم تێگەیشتنەدا ناگونجێت.

# هەندێک سەرنج و بیروڕا لەبارەی دۆخی فەرهەنگ و زمانی کوردییەوە

## ڕوونکردنەوەیەک:

هاوینی ٢٠٠٣ بە سەردان چووبوومەوە بۆ کوردستان و لە دەرفەتێکدا چاوم بە بەڕێزان جەنابی کاک مەسعوود بارزانی و کاک نێچیرڤان بارزانی کەوت. لەگەڵ کاک مەسعووددا بە دوورودرێژی باسی زمان و فەرهەنگی کوردی و ئاستەنگ و کێشەکانمان کرد. جەنابی بارزانی داوای لێ کردم کە ئەو بیر و بۆچوونانە بە نووسین بنێرمە خزمەتی. کە یەک دوو ڕۆژ دواتر چاوم بە کاک نێچیرڤان بارزانی کەوت، دیار بوو لەو ماوەیەدا جەنابی کاک مەسعوود ئەوەی بۆ باس کردبوو کە داوای نووسینێکی وەهای لێ کردووم، کاک نێچیرڤان داوای کرد کە نوسخەیەک لەو نووسینە بنێرمە خزمەتی ئەویش. لە دواڕۆژەکانی مانگی هەشتدا کە بەرەو سوێد دەگەڕامەوە، نووسینەکەم نارد بۆ بەڕێزان کاک مەسعوود و کاک نێچیرڤان.

لەو ڕۆژانەدا نوێنەرانی حوکوومەتی کوردستان لە بەغدا لە گوتوبێژدا بوون لەسەر داڕێشتنی دەستووری تازەی عیراق. کاک نێچیرڤان کە ئەم نووسینەی خوێندبووەوە، یەکسەر نوێنەرانی کوردی ئاگادار کردبوو کە دەبێ مەسەلەی دووزمانەیی (Bilingualism) لە دەستووردا بچەسپێنن.

لەم لاپەڕانەدا هەوڵ دەدەم بە کورتی چەند سەرنج و بیروڕایەک سەبارەت باری فەرهەنگی لە ئەمڕۆی کوردستاندا بخەمە بەرچاوتان. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە پلەی یەکەمدا بیر و سەرنجەکانم لەبواری فەرهەنگدا دەبن (زمان، ڕۆژنامەگەری، دەستگاکانی ڕاگەیاندن، زانستگە و پەروەردە...هتد) چونکە من زیاتر شارەزای ئەو بوارەم و کەموکووڕییەکان باشتر دەناسمەوە. لە بەشی دووەمی ئەم نامەیەدا هەندێ سەرنجی گشتی دەردەبڕم کە ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە زمان و فەرهەنگەوە نییە، بەڵام لە چوارچێوەی گشتیی هەلومەرجی ئەمڕۆی کوردستاندا گرنگن و ئاوڕلێدانەوەیان پێویستە.

لە ماوەی دە ساڵی ڕابوردوودا زۆرجار هەوڵم داوە بیر و سەرنجەکانم لەبارەی فەرهەنگی کوردییەوە بگەیێنمە دەستەڵاتی سیاسیی کوردستان و دەستگا فەرهەنگییەکان و خوێنەری ئاسایی کوردیش. بەداخەوە وەرام و کاردانەوەیەکی ئەوتۆم دەست نەکەوتووە، کە وا هەست بکەم ئەو لێپرسراو و دەستگایانە بەڕاستی لە مەبەست و گەوهەری بیر و سەرنجەکان گەیشتبن.

ڕەنگە بکرێ بڵێم بەشی هەرە زۆری ناتەواوی و کەموکووڕییەکانی ژیانی فەرهەنگیمان پێوەندیی بە یەک تێرم و یەک چەمکەوە هەیە کە پێی دەگوترێ (سیاسەتی فەرهەنگی: السياسة الثقافية). دیارە من نیازێکی وەهام نییە لە نامەیەکی وەک ئەم نامەیەدا باسێکی گرنگ و ناوەندی و ئاڵۆزی وەک سیاسەتی فەرهەنگی ڕوون بکەمەوە، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەوڵ دەدەم ڕووناکی بخەمە سەر ناتەواوییەکانی فەرهەنگی کوردی، ڕەنگە مەودا جیاجیاکانی سیاسەتی فەرهەنگییش ڕوونتر بێنە بەرچاو.

لە هەموو (یا ڕەنگە زۆربەی) دەوڵەتانی دنیادا، وەک چۆن سیاسەتی سەربازی و سیاسەتی ئابووری و سیاسەتی پەروەردەیی هەیە، هەروەهایش سیاسەتی فەرهەنگی کۆڵەکەیەکی گرنگ و پتەوی ڕاگرتن و بەهێزکردنی نەتەوە و نیشتمانە. ئەم سیاسەتی فەرهەنگییە ئەگەر لە بنەما گشتییەکاندا شێوەیەکی چەسپاو و دامەزراوی هەبێت، بەڵام بەپێی قۆناغ و سەردەم ئامانجەکانی دەگۆڕێن و هەر بەو پێیەیش

شێوەی پیادەکردن و بەڕێوەبردنی گۆڕانی بەسەردا دێت.

بۆ نموونە ئەگەر نەتەوە لە قۆناغی دامەزران و خۆپێگەیاندندا بێت، هەموو لایەنەکانی سیاسەتی فەرهەنگی وا دادەڕێژرێن کە ببنە بنەما بۆ درووستبوونی نەتەوە و ڕۆنانی بناغە و ستوونەکانی. یان ئەگەر نەتەوەیەک گەورەیی و بایەخی خۆی لە ڕابوردووی خۆیدا ببینێت، ئەوا سیاسەتی فەرهەنگی بە جۆرێک دادەڕێژرێ کە هەموو لاپەڕە زێڕینەکانی مێژووی نەتەوەکە ببووژێنرێنەوە. ئەگەر نەتەوەیەک پارچە پارچە بێت، سیاسەتی فەرهەنگی وا پیادە دەکرێت کە بنەما و چەمکە ناوکۆیی و هاوبەشەکان بەهێز دەکرێن و ڕووناکییان دەخرێتە سەر. ئەگەر نەتەوە بیەوێ خۆی لە نەتەوەیەکی دیکە هەڵاوێرێ، سیاسەتی فەرهەنگی ئەوە دەکاتە ئامانجی خۆی کە ئەدگارە تایبەتییەکان بەرز بکرێنەوە و ڕووناکییان بخرێتە سەر. دەکرێ لەم ڕووەوە دەیان نموونە بهێنینەوە. ئەمە سادەکردنەوەی چەمکی سیاسەتی فەرهەنگییە. بە هیوای ئەوەی لە دەرفەتی دیکەدا ڕوونتر و دووردرێژتر لەم بارەیەوە بنووسم.
دیارە کە دەڵێم دەبێ دەستەڵاتی سیاسی ببێتە هاندەر و بزوێنەر و بەجێهێنەری سیاسەتی فەرهەنگی هەرگیز مەبەستم ئەوە نییە سانسۆر (رقابە) درووست بکرێت و فەرهەنگ پاوان بکرێت بۆ ئیدیۆلۆگی و ئامانجەکانی دەوڵەت و دەستەڵات، یان مەوداکانی ئازادی، بەتایبەت ئازادیی دەربڕین، تەسک بکرێنەوە. دەستەڵات دەبێ ببێتە ئامرازێک بۆ بەجێهێنان و خستنەگەڕی نەخشەکان، دەبێ هەموو هێزی ماددی و قانوونی و کارگێڕیی خۆی تەرخان بکات بۆ کارئاسانی و ببێتە ناوەندی هاوئاهەنگیی لایەنە جیاوازەکانی نەتەوەکە و پێکەوە گرێدانیان.
ئەگەر چاوێک بە مێژووی سیاسیی کورددا بگێڕین، هەر زوو لەوە دەگەین کە میرنشینەکانی کورد بە هیچ جۆرێ سیاسەتێکی فەرهەنگییان نەبووە، بە ئامانجی پێگەیاندن و ڕۆنانی نەتەوەی کورد یان هۆشیاریی نەتەوایەتی. سیاسەتێکی وەها لە دەستگای دەستەڵاتدا

نەبووە و بیری لێ نەکراوەتەوە، بەڵام لای هەندێ تاکەکەسی وریا و هەڵکەوتوو ئەم بیرە بە ئاشکرا هەبووە و بە شێوەی جیاواز دەریانبڕیوە. لەم ڕووەوە دەشێ ناوی شەرەفخانی بەتلیسی، ئەحمەدی خانی، ئەوڕەحمان پاشای بابان، مەولانا خالیدی نەقشبەندیی شارەزووری و حاجی قادری کۆیی بهێنین.
ئەم مرۆڤە هەڵکەوتووانە هەستی نەتەوایەتییان هەبووە و لە زۆر لایەنی کێشەی یەکنەگرتن و لاوازیی هەستی نەتەوەیی کورد گەیشتوون، بەڵام نەیانتوانیوە بیروباوەڕەکانی خۆیان پیادە بکەن، چونکە سەردەمەکەیان لەبار نەبووە و ئاستەنگەکانیان یەکجار گەورە بوونە. هاوکاتیش گەلەکەیان لە پلەیەکی یەکجار نزمدا بووە و پاشکەوتوویی لە هەموو بەرەکانی ژیاندا ڕەنگی داوەتەوە.
لە مێژووی نوێتردا دیارە هەستی نەتەوایەتی پتەوتر بووە و گەشەی کردووە و ژمارەی ئەو مرۆڤە هەڵکەوتووانەی بیریان لەم بابەتە کردۆتەوە و کاریان بۆ کردووە زۆرتر بووە (ئەمانە زۆربەیان ڕووناکبیر و شاعیران بوون) . لەناو ئەو کەسانەیشدا کە دەستەڵاتی سیاسییان بە دەستەوە بووە دوو کەس هەبوون کە هۆش و هەستێکی قووڵی نەتەوایەتییان هەبووە و کاتێ ئەمڕۆ سەرنجی کار و ژیانیان دەدەین، دەزانین لە زۆر بواردا، لەوانەیش فەرهەنگ، ئامانجی بنیاتنانی نەتەوە لایان ڕوون بووە: قازی محەمەد و مەلا مستەفای بارزانی.
قازی لە ماوەی ئەو ٤٥ ساڵەدا کە حزبی دیموکراتی کوردستان دەستەڵاتی ناوچەی موکریانی بە دەستەوە بوو کۆمەڵێک کاری گرنگی ئەنجام دا و زمان و فەرهەنگی کورد گەشەکردنێکی بەرچاوی بە دەست هێنا کە تا ئەمڕۆیش شوێنەواری دەبینین.
دەستەڵاتی سیاسیی ڕاستەوخۆی مەلا مستەفای بارزانی تەنیا لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ دا بوو. ساڵانی دیکەیش کە ڕێبەری شۆڕشی ڕزگاریخوازانەی کورد بوو لە بواری فەرهەنگدا گەلێک کاری گەورە ئەنجام دراون. بەڵام ئەو چوار ساڵەی ئاشتی ویست و خواست و هۆش و بیری نەتەوایەتیی بارزانی دەردەخات، کە ئەنجام و بەرهەمەکانی هەتا ئەمڕۆیش لە ژیانی فەرهەنگیماندا دیارن. بارزانی بە

درێژایی ساڵانی ١٩٥٩-١٩٧٥ بۆ بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی هۆشیاریی نەتەوایەتی و بە ئامانجی بنیاتنانی نەتەوە خەباتی کردووە. سەرکەوتنی هەرە گەورەی بارزانی چوار ساڵی بەیانی ئازار بوو، کە فەرهەنگ و زمانی کورد بە شێوەیەکی نائاسایی گەشەی کرد. لەو چوار ساڵەدا لە دوو لایەنەوە بەرهەمی گەورەمان چنگ کەوت: یەکەم: چەسپاندنی زمانی ئەدەبی و ستانداردی کوردی کە لە سەرتاسەری کوردستانی عێراقدا بوو بە زمانی خوێندن و کارگێڕی و دەستگاکانی ڕاگەیاندن؛ دووەم: گەشەکردنی هۆشیاریی نەتەوایەتی و هەستی خۆبەکوردزانین کە قۆناغێکی گرنگ بوو بۆ بۆ گواستنەوەی کورد لە کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی و پەرتەوازە و دابڕاوەوە بەرەو بنیاتنانی نەتەوە، گواستنەوەی کورد لە خەڵکێکی سەربە کۆمەڵێ خێڵ و تیرە و هۆز و ناوچە و زاراوا و ئایینزاوە، بەرەو نەتەوەیەکی هاوزمان و هاوهەست و هاوئامانج.

دەمەوێ ئەم ڕاستییانەی سەرەوە بکەمە نوختەی دەرچوون بۆ پێشکەشکردنی سەرنج و باوەڕەکانم لە بارەی زمان و فەرهەنگی کوردەوە کە لە چەند خاڵێکدا ڕوونیان دەکەمەوە.

دەستەڵاتی سیاسیی کوردستان (حکوومەتەکانی هەرێم و دەستگا حزبی و کارگێڕی و فەرهەنگییەکان) دەبێ هەوڵ بدەن بۆ گەڵاڵەکردنی سیاسەتێکی فەرهەنگی کە ڕاست و زانستی و نەتەوەیی بێت. هەڵگرتن و پیرۆکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتێکی وەها پێویستی بەوەیە زۆر بە وردی لەم باسە بکۆڵرێتەوە، پێویستییە گەوهەرییەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی نەتەوەی کورد دیاری بکەین و لە بەر ڕووناکاییی لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و زانستیدا ئامانجە دوور و نزیکەکانی سیاسەتی فەرهەنگی دیاری بکرێن. دەبێ فەرهەنگی کوردی لە سایەی دەستەڵاتی کوردیدا ئامانجێکی ڕوون و دیاریکراوی هەبێت: بنیاتنانی نەتەوە. هەموو قۆناغ و کار و پرۆژەکانیش لە خزمەتی ئەو ئامانجەدا بن.

دوای ئەوەی کە لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ دا پرۆسەی بنیاتنان/ دروستکردنی نەتەوە زۆر گەشەی کرد، هەرەسی بەهاری ١٩٧٥ و

سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی بەعس بوونە هۆی لاوازبوونی هەندێ لە بنەما گرنگەکانی بیر و هۆشی نەتەوایەتی، بەڵام هاوکاتیش گیانی بەرگری و بەرهەڵستی لای بەشێکی گرنگی خەڵکی کوردستان بەهێزتر بوو. ڕووناکبیرانی کورد (بەتایبەت نووسەران) هەڵوێستێکی نیشتمانپەروەرانە و هۆشیارانەیان هەبوو، لە پاراستن و گەشەپێدانی فەرهەنگ و زمانی کوردیدا، چونکە ڕووبەڕووی دوژمنێکی سەرسەخت و ڕەگەزپەرست ڕاوەستابوون. بەڵام فاکتەری ڕووخێنەر و هەڵوەشێنەوەی بیری نەتەوایەتی زۆر بەهێزتر بوو، زۆر زوویش تەشەنەی کرد، تا کوردی گەیاندە قۆناغێکی خەتەرناکی خاوبوونەوە. ئێستا کە ئەوە ١٢ ساڵە حوکمی بەشێکی زۆری کوردستان بە دەست کورد خۆیەوەیە، دەبوو دەستەڵاتی سیاسی بە لێکدانەوەی باری فەرهەنگیی کوردستان سیاسەتێکی فەرهەنگیی ورد و ژیرانە و دووربینانەی بگرتایەتە بەر. بەڵام ئەوەی دەیبینین، ئەوەمان پێشان دەدات کە دەستەڵاتی سیاسی بووەتە هۆی لاوازبوونی هەست و هۆشی نەتەوایەتی/ خاوبوونەوەی پرۆسەی بەنەتەوەبوون و خۆبەکوردزانین/ هەڵوەشاندنەوەی گەلێ لەو بنەما گرنگانەی کە یەکێتیی نەتەوەیی و ڕاگرتنی هەستی نەتەوایەتیمانی دەستەبەر دەکرد. ئێمە دەتوانین قۆناغەکانی پرۆسەی بەنەتەوەبوون بەم جۆرە وێنا بکەین:

لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا ١٩٥٩ : قۆناغی خێڵەکی و پەرتەوازەبوون لەسەر بنەمای ناوچەیی و زاراوایی و ئایینزا.

١٩٦٠ تا ١٩٧٠: سەرەتای هەنگاونان بەرەو درووستبوونی هۆشیاریی نەتەوایەتی و شکڵپێدانی خیتاب (دیسکۆرس)ی نەتەوایەتی.

١٩٧٠ تا ١٩٧٤ : قۆناغی بەرزبوونەوەی هۆشیاریی نەتەوایەتی/ گەشەکردنی پرۆسەی بنیاتنانی نەتەوە و خۆبەکوردزانین.

١٩٧٥ تا ١٩٩٢ : قۆناغێکی تێکەڵ لە دوو تەوژمی تەواو پێچەوانە.

١٩٩٢ تا ٢٠٠٣ : قۆناغی خاوبوونەوە، هەڵوەشاندنەوە و هەڵتەکاندنی بنەماکانی ڕۆنانی نەتەوە و خۆبەکوردزانین.

هەر کەسێک شارەزای زمانی کوردی بێت و ئاگاداری چاپەمەنی و ڕۆژنامە و گۆڤار و دەستگاکانی دیکەی کوردستان بێت، باش لەوە دەگات کە زمانی کوردی چەندە لاواز بووە و چۆن بەرەو هەڵدێری پووچانەوە دەچێت. ئێرە جێگەی ئەوە نییە بە دووروودرێژی نموونە لەسەر ئەو سەدان و هەزاران هەڵە و ناشیرینی و تێکدانانە بهێنمەوە کە دەبینرێن و دەبیسترێن. ناتەواوی و شێواندن و تێکدان سێ بواری گرنگی زمانی کوردیی گرتۆتەوە: ڕێزمان، ڕێنووس، گەنجینەی وشە.
ئەگەر تەنیا بیر لە چەندایەتی بکەینەوە دیارە ئەمڕۆ سەد ئەوەندەی جاران چاپەمەنی بە زمانی کوردی بڵاو دەبێتەوە، بەڵام لە ڕووی چۆنایەتییەوە زمانەکە زۆر شێواوە و لە ڕووی یەکێتی و هاوئاهەنگیی زمانیشەوە هێندە درز خراوەتە ناویەوە کە دەبنە هەڕەشەیەکی ئاشکرا لە بوون و بەردەوامبوونی زمانی کوردی.
زمانی ئەدەبی و ستانداردی کوردی بەرهەمی چەند سەدەیەکی مێژووی کوردە و پلەیەکی یەکجار گرنگی بڕیوە، بەتایبەت لە کوردستانی عێراقدا. ئەورووپاییەکان بۆ پێشخستن و گەشەپێدانی زمانی خۆیان دوو سەرچاوەی گرنگیان هەیە:
یۆنان: بۆ تێرم و زاراوەی فەلسەفی و قانوونی و فکری،
لاتین: بۆ پەیداکردنی ڕەگوڕیشەی وشە و ڕۆنانی وشەی نوێ.
ئێمەی کوردیش دوو سەرچاوەی گرنگمان هەن و دەبێ سوودیان لێ وەرگرین؛ یەک: زانستە ئیسلامییەکان بۆ تێرم و زاراوەی فکری و فەلسەفی و کارگێڕی و قانوونی، دوو: زمانانی ئێرانی، بۆ گەڕانەوە بۆ ڕەگوڕیشەی وشە و دانانی وشەی تازە بە سوودوەرگرتن لە زانستی ئێتیمۆلۆگی.
لە هیچ سەردەمێکی مێژووی کوردستاندا ئەوەندەی ئەمڕۆ پێویستمان بەوە نەبووە کە یەکێتیی زمان و فەرهەنگ جەخت بکەین و بیانکەینە کەرەستەی یەکگرتوویی و یەکێتیی نەتەوە و بنیاتنانی، کەچی ڕێک لەم کاتەدا زۆر هەوڵی ناڕەوا دەدرێ بۆ دروستکردنی درز لەناو کورددا بە هۆی زمانەوە.

له سالانی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤ دا دەستەڵاتی سیاسیی کوردستان سیاسەتێکی زۆر هۆشیارانەی بە ڕێوە برد کە زمانی کوردیی وەک زمانێکی ستاندارد کردە زمانی ڕەسمیی هەموو کورد لە مەندەلی و خانەقینەوە تا کەرکووک و زاخۆ و سلێمانی و هەولێر. بۆچی دەبێ ئەمڕۆ و لە کاتێکدا کە لە ڕووی سیاسییەوە پێشکەوتنی گرنگ و بەرچاو وە دی هێنراون، لە ڕووی فەرهەنگ و زمانەوە پاشەکشە بکەین؟ بۆچی لەم کاتەدا ئەو دوو هۆکارە گرنگەی یەکگرتن و بنیاتنانی نەتەوە بە دەستی خۆمان هەڵوەشێنینەوە؟

من بە هۆی ئەوەوە کە هەموو بەشەکانی کوردستان گەڕاوم و پێوەندییەکی پتەو و گەرمم لەگەڵ کوردی هەموو پارچەکانی کوردستاندا هەیە، زۆر چاک لەوە گەیشتووم کە هۆشیاری و هەستی نەتەوایەتیی کورد، هۆشی خۆبەکوردزانین، ناسیۆنالیزمی کورد تەنیا لە کوردستانی عێراقدا پێش کەوتووە و قۆناغێکی باشی بڕیوە (ئەگەرچی لێرەیش دەیان کەموکووڕیی تێدایە و بناغەکانی لەرزۆکن). کە بیر لەو ڕاستییە دەکەینەوە باشتر لەوە دەگەین کە بۆچی بە لای هەموو دژمنەکانمانەوە گرنگە بناغەکانی یەکپارچەیی و یەکگرتنی کورد و بناغەکانی هۆشیاریی نەتەوایەتی (کوردایەتی) لە پێشکەوتووترین بەشی کوردستاندا هەڵتەکێنن! باشتر لەوە دەگەین کە بۆچی نەیارەکانمان بە هەموو شێوەیەک کار بۆ ئەوە دەکەن کە گرنگترین بناغەی کوردایەتی (کە زمانە) هەڵوەشێننەوە! چاکتر لەوە دەگەین کە بۆچی دەیانەوێ پرۆسێسی ستانداردبوونی زمانی کوردی ڕاوەستێنن و بۆ دواوەی بگەڕێننەوە و پرۆسێسی بنیاتنانی نەتەوە هەڵوەشێننەوە و بۆ دواوەی بگەڕێننەوە! لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە خۆیشمان، بە تایبەت دەستەڵاتی سیاسی، بە نەزانی و کەمتەرخەمی ببینە هاوکار و یارمەتیدەری ئەم هەوڵی تێکدان و هەڵوەشاندنەوەیە. ئێمە ئەگەر وێنەیەکی گەشەکردن و ستانداردبوونی زمانی کوردی بکێشین ڕەنگە ئاوا بێتە پێش چاو:

قۆناغی یەکەم: زمانێکی پەرش و بڵاو/ نەبوونی هیچ شێوەیەکی هاوئاهەنگی و یەکگرتن.

قۆناغی دووەم: هەوڵدانێکی چاک و جیددی بۆ ستانداردکردنی زمانی کوردی/ پێشکەوتنێکی بەرچاو بۆ درووستکردنی هاوئاهەنگی و یەکگرتن.

قۆناغی سێیەم: خاوبوونەوەی پرۆسێسی ستانداردبوونی زمان/ هەڵوەشاندنەوەی گەلێ لە بنەما و بناغە گرنگەکانی یەکگرتن و ستانداردبوون (ئێستا ئێمە لەم قۆناغەدا دەژیین).

هەڵەیەکی یەکجار گەورە و نەبەخشراو ئەوەیە کە لە کوردستانی عێراقدا ڕێگە دراوە ئەلفوبێی تورکی = لاتینی بۆ نووسینی زمانی کوردی بە کار ببرێت و گومان بخرێتە سەر ڕاستی و گرنگی و بایەخی ئەلفوبێی کوردی (کە لەسەر بناغەی ئەلفوبێی عەرەبی/ فارسی دانراوە). هەموو ئەو بەڵگە و قسانەی لەبارەی چاکی و گونجانی ئەلفوبێی تورکی- لاتینییەوە دەگوترێ، قسەی نازانستین و هیچ بناغەیەکی زمانەوانی و مەنتقی و ڕاستییان نییە. ئەم بۆچوونە تەنیا خۆهەڵواسینە بە بێگانەپەرستی و ڕۆژاواپەرستیدا و لاساییکردنەوەی ئەزموونی تورکیایە (کە ئەزموونێکی پڕ لە شەرمەزاری و ئاوڕووچوونە) و دژایەتیکردنی فەرهەنگی ناوکۆ و هاوبەشی ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامییە. زۆریش ئاشکرایە ئەوانەی لە پشت ئەم جۆرە بیرکردنەوانەوە وەستاون و کاری بۆ دەکەن، کێن و چییان دەوێ! بەکارهێنانی ئەلفوبێی تورکی- لاتینی لە تەلەڤیزیۆنی کوردستاندا، هەروەها بۆ چاپکردنی هەندێ گۆڤار و بڵاوکردنەوەی هەندێ کتێب بەو ئەلفوبێیە، هەر هەموویان کۆمەڵە هەنگاوێکن بەرەو لاوازکردن و تێکشکاندنی زمانی کوردی و بەرەو هەڵوەشاندنەوەی بناغەکانی یەکگرتنی زمان و فەرهەنگ و هۆشیاریی نەتەوایەتی. ئەلفوبێی کوردی یەکێکە لە بنەما بەرز و گرنگ و پتەو و پیرۆزەکانی نەتەوەی کورد و نابێ بە هیچ جۆرێک و لەبەر هیچ هۆیەک سازشی لەسەر بکرێت، یان تەنانەت ڕێگە بدرێت بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و لێدوانی گشتییەوە. ئەو نەتەوانەی ڕابوردوویەکی گرنگ و شارستانەتییەکی دێرینیان هەیە و خاوەنی فەرهەنگێکی نەتەوایەتین و ڕێز لە خۆیان و

فەرهەنگ و ڕابوردوویان دەگرن هەرگیز بیر لە گۆڕینی ئەلفوبێ ناکەنەوە.

سیستەمی پەروەزدە و فێرکردن بەشێکی ژیاری و گرنگی مانەوە و پێشکەوتن و خۆڕاگرتنی نەتەوەیە، چونکە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە درووستبوونی نەوەی پاشەڕۆژەوە (ئەو ژن و پیاوانەی لە پاشەڕۆژدا وڵات دەبەنە ڕێوە) هەیە و چونکە عەقڵ و فکر و بیر و هۆشیاریی پاشەڕۆژی لەسەر بنیات دەنرێ. لە بەر ئەوەیش بۆ نەتەوەیەکی وەک کورد یەکجار گرنگە کە سیستەمی پەروەردە لەسەر کۆمەڵە بناغە و بنەمایەکی زانستی و نەتەوەیی و شارستانەتی دابمەزرێ و یەکێتی و بەردەوامیی نەتەوەکە بپارێزێت، لە کاتێکدا سوود لە چاکترین و تازەترین شێوازەکانی زانست و تەکنیکی مۆدێرن وەردەگرێ، هاوکاتیش بنەما نەتەوەیی و شارستانییەکانی خۆی و نرخە ڕۆحی و مرۆڤییەکانی خۆی بپارێزێ.

هێندەی من ئاگادار بم دەستەڵاتی سیاسی لە کوردستان، لە بواری پەروەردەدا تووشی کۆمەڵێ هەڵەی وا هاتووە کە دەبنە هۆی تێکدانی گەلێ لە بناغەکانی یەکگرتوویی کورد. جیاکردنەوەی زمانی خوێندن لە ناوچەی بادینان یەکێکە لەو هەڵە نەبەخشراوانە. ئەمە سەرەتایەکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی زمانی یەکگرتوو، بۆ هەڵوەشاندنەوەی نەتەوەیەکی یەکگرتوو. لەم بوارەدا هەموومان سالانی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤مان لە بیرە کە لە هەموو کوردستاندا یەک زمان بە کار دەبرا، هەروەها سالانی پێش و دوای ئەو چوار ساڵەیش هەر وا بوو. ئێستا بە دەستی خۆمان ئەوەی لە ماوەی سەد ساڵی ڕابوردوودا بنیاتمان نابوو، هەڵیدەتەکێنینەوە.

لەم بوارەشدا نابێ بە هیچ جۆرێ سازش بکەین یان بیر لە ناوچەگەری و بەرژەوەندی سیاسی بکەینەوە. بۆ ئێمە بەرژەوەندیی نەتەوە پێش هەموو بەرژەوەندییەکانی دیکەیە و ڕێگایش هەر ئەوەیە کە زمانی ستانداردی کوردی ببێتە زمانی ڕەسمیی خوێندن و پەروەردە و فێرکردن و لە هەموو دەستگاکانی کوردستاندا زمانی ڕەسمی بێت.

لایەنێکی دیکەی ئەم باسە لاوازی و خراپیی ئەو زمانەیە کە لە کتێبەکانی خوێندنی قوتابخانەکانی کوردستاندا بە کار دەبری، کە زمانێکی بێپێز و سەقەتە. دەزانم ئەمە بە دوو ڕۆژ جێبەجێ ناکرێت، بەڵام دەبێ بەشێکی گرنگی نەخشە و پلانی سیاسەتی فەرهەنگی بێت.
کۆڕی زانیاریی (نەک زانیاری) کوردستان دەبوو دەستگایەک بێت بۆ پێشخستن و بووژاندنەوە و پاراستنی فەرهەنگ و زمانی کوردی. ئەرکێکی وا گرنگ بە دەستگایەک دەکرێت کە لە هەموو ڕوویەکەوە ڕێکوپێک و کامڵ و زانستی بێت. ئەم دەستگایەی ئەمڕۆ بە ناوی کۆڕی زانیارییەوە کار دەکات زۆر لەوە لاوازترە بەرامبەر کێشە گرنگەکانی فەرهەنگی نەتەوایەتیمان خۆی ڕابگرێت. گرفتەکانی زمان و فەرهەنگی کورد، هێندە گەورە و قووڵن کە نە بە دەستگایەکی وەک کۆڕ و نە بە کادر و کاربەدەستی وەک ئەندامانی کۆڕ چارەسەر دەکرێن (لە گەڵ ڕێزم بۆ هەموویان، تەنانەت ئەوانەیشیان کە پێم وایە نەخوێندەوارن). هەڵبژاردن و دیاریکردنی کادرانی کۆڕ لەبەر هۆی سیاسی و گوێڕایەڵیی حیزبایەتی هەڵەیە و دەبێ تەنیا پلەی زانستی و فەرهەنگی و دڵسۆزیی نەتەوەیی و لێهاتوویی بکرێنە پێوەر.
ئێستا کە عێراق وەک دەوڵەتێک هەڵوەشاوەتەوە و سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە، زۆر گرنگە جێگە و پایەی کورد لەو دەوڵەتەدا ڕوون و ئاشکرا بێت. دەبێ نوێنەرانی سیاسیی کورد لە ئێستاوە ئەوە جەخت بکەن کە عێراقی داهاتوو وڵاتێکی دووزمانەیە (ثنائي اللغة: Bilingual). دەبێ ئەمە داوایەکی بێ چەندوچۆن بێت و لە دەستووردا جێگر بێت. بەپێی بنەمای دووزمانەیی، دەبێ هەردوو زمانەکە وەک زمانی ڕەسمیی دەوڵەت لە هەموو بوارەکاندا بە کار ببرێ: درووشم(شعار)ی ڕەسمیی دەوڵەت/ پارە/ پوولی پۆستە/ ناوی شەقامەکان/ بانگکردنی ناو فڕۆکەخانە و هۆیەکانی گواستنە و ڕاگەیاندن و پلە جیاوازەکانی خوێندن. لەم ڕووەوە کۆمەڵێ مۆدێل و نموونەی زیندوو لە دنیادا هەن کە دەکرێ سوود لە ئەزموونەکانیان وەربگرین: فینلاند/ بەلژیک/ ئیسرائیل/ سویسرا و کەنەدا...هتد.

والاکردنی دەرگاکان بۆ بەناو ڕووناکبیرانی کوردستانی تورکیا، سووریا، ئێران و سۆڤییێت بەو جۆرەی تا ئێستا کراوە، کارێکی ڕاست نییە و ئەنجامەکەیشی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە بە زیانی ئێمە و پلەی باوەڕپێکراوی و پشتپێبەستراوی (مصداقية)ی ئێمە و بزووتنەوەی کوردایەتی دەشکێتەوە. بەشێکی زۆری ئەوانەی بە ناوی دەستگای فەرهەنگی و سیاسیی بەشە جیاوازەکانی کوردستانەوە دێنە کوردستانی عێراق کەسانێکی هەلپەرستن و ماوەیەکی دوورودرێژ دژی بزووتنەوەی کوردستانی عێراق، بە تایبەت پارتی، بوونە و ئەمڕۆ لە ئەنجامی تێکشکانی سیاسەت و بیری خۆیاندا هاتوون بەرگی کوردایەتی و دڵسۆزیی بارزانییان پۆشیوە. زۆربەی ئەو کەسانە بە مەبەستی پارەپەیداکردن دێن و پرۆژەی درۆزنانەی خەیاڵی دێننە پێشەوە بۆ پاساودانی پارەوەرگرتن. هەندێ لەو پرۆژانە هەر لە بنەڕەتدا دژی یەکێتیی نەتەوەی کورد و فەرهەنگی کورد و فەرهەنگی ئیسلام و فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتن. لە ناو ئەمانەدا کەسانێک هەن کە بۆ لایەنێکی بێگانە کار دەکەن و کوردبوونیان دەکەنە پردێک بۆ ئەوەی بێنە ناو کوردستانەوە و پرۆژە ژاراوییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن. هەندێک لەمانە تا ئەو ڕادەیە کەوتوونەتە داوی هێزەکانی بێگانەوە کە ئیدی ناتوانن لێی دەربچن و هەرگیز جارێکی تر سوودێکیان بۆ کورد نابێت. من کە ئاوا بە ڕاشکاوی ئەم بیروڕایانە دەنووسم دەتوانم زۆر بە ئاسانی هەموو نموونەکان بە ناو باس بکەم، بەڵام پێم جوان نەبوو ناوی کەس بهێنم. لە ناو ئەمانەدا، بە تایبەت ڕووناکبیرانی کوردستانی تورکیا، تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر کەوتوونەتە ژێر کارکردی فەرهەنگ و ئیدیۆلۆگی و بیری کەمالیزمەوە (باوەڕەکانی کەمال ئاتاتورک). ئەمانە لەبەر گەلێ هۆی سیاسی هیچ پێوەندێکیان بە فەرهەنگ و نەریت و ڕابوردووی نەتەوە و نیشتمانەکەیانەوە نەماوە. بارودۆخی ڕووناکبیرانی کوردستانی تورکیا لە زۆر ڕووەوە لە بارودۆخی جەزائیر دەچێت. تەنانەت ٤٠ ساڵ دوای ڕزگاربوونی جەزائیر هێشتایش پێویستییان بە کۆمەکی فەرهەنگیی وڵاتانی عەرەبە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ڕەگوڕیشە و فەرهەنگی خۆیان. کوردی

تورکیایش پێویستی بە ساڵانێکی دوور و درێژی کۆمەکی ئێمەیە بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ببنەوە بە کورد و فەرهەنگ، مێژوو، شارستانی و نرخەکانی کوردەواری فێر ببن. بەڵام شتی هەرە سەیر ئەوەیە کە لە کوردستانی عێراقدا هەلومەرجێکی وا درووست بووە کە لە جێی ئەوەی ئێمە ڕێنوێنیی ئەوان بکەین، کەچی هەندێ ڕووناکبیری نەخوێندەوار و کەمالیست و تورکێنراوی ئەو بەشەی کوردستان خۆیان وا نیشان دەدەن کە ڕێنوێنیی ئێمە دەکەن. لە ماوەی ٧٠ ساڵی ڕابوردوودا سیاسەتی تورکیا کارێکی وای کردووە کەسانێک درووست بوونە کە ڕێک و ڕەوان قوتابیی دڵسۆز و لێهاتووی کەمالیزمن. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە لە سیاسەتدا بۆچوونی زۆر سەیر و پەڕگرانەیان لە ناودا پەیدا دەبێت (نموونەیش لەو ڕووەوە زۆرن).

ئەو کۆنفرانس و کۆنگرە و سەمینار و فێستیڤاڵانەی لە کوردستان ڕێک دەخرێن بەداخەوە مەرجی جددیبوون و زانستییان یەکجار کەمە. ئەگەرچی پارە و توانستێکی یەکجار زۆریان بۆ تەرخان دەکرێت، بەڵام ئەنجامەکانیان ئەوەیە کە هەرکەسێکی زانستخواز و وردبین دەزانێ ئەم چالاکییانە سوودێکیان بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی و گەشەکردنی فەرهەنگی کوردی نییە.

ئەگەرچی مەسەلەی ئازادیی دەربڕین یەکێکە لە باسە گرنگەکانی دنیای ئەمڕۆ، کەچی لە کوردستاندا تا ئێستایش دەسەڵاتی سیاسی نەیتوانیوە میکانیزمێک بدۆزێتەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. زۆر سەیرە نوێنەرانی سیاسیی نەتەوەیەک کە دووسەد ساڵە بۆ ئازادی و سەربەخۆیی تێدەکۆشێت، ئێستا دەسەڵاتی خۆیان بۆ سەرکوتکردنی نووسەران و لاوانی ئازادیخواز و گوڵە تازە پشکووتووەکانی کوردستان بخەنە گەڕ.

لە ئەنجامدا جارێکی دیکە دێمەوە سەر ئەو باسەی لە سەرەتای ئەم نامەیەدا ڕوونم کردەوە. هەموو کێشە و گرفت و ناتەواوی و کەموکووڕییەکانی زمان و فەرهەنگی کوردی بەستراون بەو ڕاستییەوە کە دەسەڵاتی سیاسیی کوردستان تا ئێستا لە بایەخی

هەبوونی (سیاسەتی فەرهەنگی) نەگەیشتووە. بێ تێگەیشتن لە ناوەڕۆک و گەوهەری ئەو چەمکە هەرگیز نابینە خاوەنی زمانێکی زیندوو، نابینە خاوەنی فەرهەنگێکی دەوڵەمەند و گەشەسەندوو. پێم وایە دەبێ ئەوەیشمان لا ڕوون بێت کە نەتەوەیەکی بێفەرهەنگ و بێشارستانی و بێزمان ناتوانێ ببێتە خاوەنی پێکهاتەیەکی سیاسیی تۆکمە و سەرکەوتوو. نەتەوەیەکی بێفەرهەنگ ناتوانێ لە دامەزراندنی شارستانەتیدا، چ بۆخۆی و چ بۆ مرۆڤایەتی، بەشدارییەک بکات.

فەرهاد شاکەلی

هەولێر 26/8/2003

# نامەیەک بۆ جەنابی کاک مەسعوود بارزانی

براگەورەی هێژا و خۆشەویست جەنابی کاک مەسعوود بارزانی
سەڵاوی گەرموگوڕی برایانەتان پێشکەش بێت، هیوام خۆشی و سەربەرزیتانە.
ئەگەرچی ئێمە چەند جارێک چاومان بە یەکدی کەوتووە، بەڵام وا ڕێک نەکەوتووە لە کاتی گفتوگۆیەکاندا باسی کاروباری سیاسی بکەین، چونکە بەڕاستی من خۆم لە ئەدەبییات و زمان و فەلسەفە و تەسەووفەوە نزیکتر دەبینم تا سیاسەت، دیارە ئەمە ڕێگە لەوە ناگرێت مرۆڤێکی کورد: شاعیر، نووسەر، ڕووناکبیر، سۆفی یا هەرچییەکی دیکە، لەبارەی نەتەوە و نیشتمانی خۆیەوە بیروباوەڕی تایبەتی هەبێت و حەز بکات باوەڕەکانی خۆی بگەیێنێتە سەرکردەیەکی نەتەوەکەی.

من نامەوێ لەم نامەیەدا بە دوورودرێژی مەسەلە ئاڵۆزەکانی ئەمڕۆی کوردستان بخەمە پێش چاوتان، چونکە هێندە زۆرن کە لە نامەیەکی وەک ئەمەدا جێگەیان نابێتەوە، بەڵکە هەوڵ دەدەم تەنیا لە دوو باسی گرنگ نزیک ببمەوە کە زۆر نیگەرانم دەکەن و پێم وایە لە مەودایەکی درێژخایەندا خەتەریان لە هەموو مەسەلەکانی دیکە زۆرترە و کارکردیان قووڵتر دەبێت. هەر بۆیەیش دەبێ هەرچی زووترە بیریان لێ بکرێتەوە و چارەسەرێکیان بۆ دابنرێت کە هەم ئەنجامی بیرکردنەوەیەکی قووڵ و وردی ستراتێگی بێت و هەم لەگەڵ بەرژەوەندی درێژخایێنی نەتەوە و نیشتمانەکەماندا هاوئاهەنگ و گونجاو بێت. بە هێشتنەوەی ئەم دوو مەسەلەیە بێ چارەسەرێکی ڕاست و بنەڕەتی، لە پاشەڕۆژدا ئێشێکی یەکجار گەورەمان پێ دەگەیێنن و ڕەنگە ئەودەم ئێدی درەنگیش بێت و لەو ڕووەوە هیچمان پێ نەکرێ.

١. کەرکووک [لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە تەنیا لەگەڵ مەسەلەکانی زمانی کوردیدا خەریک دەبێت، بە پێویستم نەزانی ئەو بەشەی نامەکەم بۆ جەنابی بارزانی کە لەبارەی کێشەی کەرکووکەوە بوو لێرەدا بڵاو بکەمەوە].

٢. زمانی کوردی و ئەلفوبێی لاتینی:
هەلومەرج و وەزعی زمانی کوردی لە کوردستانی عیراقدا لە ئاستێکی یەکجار دژوار و خەتەرناکدایە. کەسێک لە زمان تێبگات و بە دڵسۆزی بیر لە ژیان و گەشەکردنی زمانی کوردی بکاتەوە زۆر چاک دەزانێت کە زمان و فەرهەنگی کوردی گەیشتووەتە لێواری هەڵدێرێکی ترسناک. پار هاوین لەسەر داوای خۆتان من نامەیەکی دوورودرێژم نووسی و ناردمە خزمەتتان، بەو هیوایەی هەندێک لە وەزعەکەتان بۆ ڕوون بکاتەوە. دیاردەیەکی دیکەی ترسێنەر ئەوەیە کە چەند ساڵێکە لە کوردستانی عیراقدا و بەتایبەت لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی پارتیدا بە ئاشکرا برەو دەدرێت بە ئەلفوبێی تورکی (لاتینی) بۆ نووسینی زمانی کوردی و زەوینەی بەکاربردنی بۆ خۆش دەکرێت. ئەلفوبێی لاتینی بە تەواوی تەلەڤیزیۆنەکانی داگیر کردووە، گەلێ جار کتێبی پێ چاپ دەکرێت و ماوەیەک گۆڤارێکی پێ دەردەکرا. ئێستایش لە ڕۆژنامەدا دەخوێنمەوە کە وەزارەتی پەروەردە کردویەتییە بەشێک لە بەرنامەی کۆلێژ و پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایان و کۆرس (خول)ی فێرکردن دەکەنەوە بۆ مامۆستایان و خۆ ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی لە پۆلەکانی سەرەتاییدا ئەلفوبێی لاتینی بە کار ببرێت. لەم نامەیەدا من ناتوانم و ناکرێت بەڵگە مێژوویی، فکری، زمانەوانی، زانستی و سیاسییەکانی ترکزە (خەتەر)ی ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەمەوە. بە پێچەوانەی مەسەلەی کەرکووکەوە، دەبێ ئەم باسەیان لە پشت پەردەوە یەکالا بکرێتەوە و چارەسەر بکرێت. چارەسەریش زۆر ڕوون و ئاشکرایە و هیچ دوودڵییەکی ناوێت: **نابێ بە هیچ جۆرێ ئەلفوبێی کوردی دەستکاری بکرێت. بەکارهێنانی ئەلفوبێی تورکی -**

لاتینی له کوردستاندا دەبێ بە هیچ شێوەیەک نە موناقەشە بکرێت و نە بیری لێ بکرێتەوە. ئەلفوبێی لاتینی ماکی شێرپەنجە (سرطان)ێکە کە ئەگەر لە ئێستاوە بنبڕ نەکرێت و هەڵنەکەنرێت، لە دوارۆژێکی نزیکدا دەبێتە هۆی داڕزان و مردنی زمان، فەرهەنگ، شارستانەتی و ناسنامەی نەتەوەی کورد. مەسەلەی ئەلفوبێی لاتینی وەک یاریکردنە بە ئاگر و نابێ بە هیچ جۆرێک بە گاڵتە و بێخەمی وەربگیردرێت. لە وڵاتێکدا کە سیستەمی خوێندن و فێرکردن ڕووخاوە، زانستگەکانی لە ڕووی زانستییەوە داتەپیون، وەزیری پەروەردەی نەخوێندەوارە، نابێ دەردێکی دیکەیش بخرێتە سەر دەرد و نەخۆشییەکانمان.

پێم وایە تا ڕادەیەکی باش من ئاگاداری ئەوەم کە کێ لە پشت بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە مۆدێلانەوەیە و بانگەشەی بۆ دەکات. ئێستا ئەوە بابەتی ئەم نامەیە نییە. بێگومان تەنیا خەڵکانی نەزان و نادڵسۆز و بێناسنامە، بەتایبەتیش شاگردانی ئیدیۆلۆگیی کەمالیزم و ڕۆژاواپەرستان، بەپەرۆشەوەن ئەم ژارە بکوژ و خەتەرناکە لە فەرهەنگی نەتەوەی کوردا بڵاو بکەنەوە. ئەوەی دەیەوێ ئەلفوبێی لاتینی لەناو کورددا بڵاو بکاتەوە یا هیچ شتێک لە زمانەوانی و زمانی کوردی و بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد نازانێت، یا دەیزانێت، بەڵام بە هۆشیارییەوە کار دەکات بۆ پارچەپارچەکردنی کورد و سڕینەوەی هەموو مێژوو، شارستانەتی، فەرهەنگ و نرخە ڕۆحی و مرۆڤییەکانی کورد. لێرەدا مەسەلە تەنیا گۆڕینی ئەلفوبێ نییە، بەڵکە شۆردنی میشک و سڕینەوەی بیری نەتەوەیەکە. بەڕاستی گەلێک یا نەتەوەیەک کەمێک ڕێزی خۆی و مێژووی خۆی وشارستانەتی و ناسنامەی خۆی بگرێت ناتوانێت بیر لە شتی وا بکاتەوە کە نەک هەر جۆرێکە لە شێتبوون و خۆکوژی، بگرە تاوانێکە نە پاساو دەدرێت و نە دەبەخشرێت.

براتان: فەرهاد شاکەلی
١٦-٨-٢٠٠٤ سۆللەنتوونا، سوێد

# نامەیەک
# بۆ دۆکتۆر شەفیق قەززاز [١]

لە کۆتاییی ساڵی ١٩٩٩دا کاک دۆکتۆر شەفیق قەززاز "فەرهەنگی شارەزوور"ی بۆ چاپ ئامادە دەکرد. لەبەر ئەوەی من هەر لە سەرەتای ١٩٨٠کانەوە ئاگاداری ئەو کارە بەنرخەی مامۆستا قەززاز بووم و پێم خۆش بوو هەرچی زووتر بڵاو ببێتەوە، بەشێکی فەرهەنگەکەی بۆ ناردم بۆ پێداچوونەوە و دەربڕینی سەرنج و تێبینییەکانم لەبارەی کارەکەیەوە. ئەم نامەیە سەرنجەکانی منن لەسەر ئەو بەشەی بۆی ناردبووم.

سۆلله‌نتوونا ١٠-٩-١٩٩٩

برای هێژا و خۆشه‌ویستم کاک شه‌فیق قه‌ززاز
سه‌ڵاوی گه‌رموگوڕی برایانه بۆ خۆت و ماڵ و منداڵ، هیوام خۆشی و سه‌ربه‌رزی و به‌خته‌وه‌ریتانه.
به‌ڕاستی ئه‌م نامه‌یه له کاتێکدا ده‌نووسم که زۆر هه‌راسانم به ده‌ست کۆلکه‌خوێنده‌واری کورده‌وه. داوای یارمه‌تی و ڕێنوێنی ده‌کات، بۆ چاکتر و ڕێکوپێکترکردنی نووسینه‌که‌ی، که‌چی پاشان ده‌ڵێ: به‌ڵام مامۆستا فلان وا ناڵێ. ده‌ڵێم کاکه گیان! مامۆستا فلان ڕه‌نگه کوردیزانێکی باش بێت و هه‌موو زاراوه‌کان بزانێت، ڕه‌نگه هه‌ژده ناوی کوردیی لا بێت بۆ وشه‌یه‌کی وه‌ک فرمێسک، یا جۆری مه‌ڕ و ماڵات، به‌ڵام ئه‌و مامۆستایه و ده‌یانی وه‌ک ئه‌ویش زماناس نین، واته (Linguist) نین. هه‌روه‌ها له ڕێزمان تێناگه‌ن و شاره‌زای پێکهاته‌ی زمانه‌که نین. له‌به‌ر ئه‌وه له‌باره‌ی ڕێنووسه‌وه هه‌رچییه‌ک بڵێن هه‌ر به‌پێی تیۆریی "ته‌وه‌که‌ل به خوا" ده‌یڵێن، نه‌ک له زانینه‌وه. با سه‌رت نه‌ئێشێنم، ده‌زانم تۆیش ده‌ردی له‌م بابه‌ته‌ت زۆر چێشتووه.
به‌ڕاستی و له دڵه‌وه ده‌ڵێم یه‌کجار زۆر دڵخۆش بووم به‌م کاره گرنگ و چاکه، به‌و هیوایه‌ی هه‌رچی زووتر بگاته ده‌ست خوێنه‌ر و توێژه‌ره‌وه و زانا و نووسه‌ری کورد. من به هۆی ئه‌وه‌وه که ئه‌وه ده دوانزده ساڵێکه له زانستگه‌ی ئوپسالا زمانی کوردی به کورد و غه‌یره‌کوردیش ده‌ڵێمه‌وه، ئه‌زموونێکی باشم ده‌ست که‌وتووه، به‌ڵام هاوکاتیش تووشی هه‌سته‌وه‌رییه‌کی سه‌یر بوومه، به تایبه‌ت له‌باره‌ی ڕێنووسه‌وه. له‌م بواره‌دا هه‌ندێ کارم کردووه، که پێم وایه ده‌توانێت ببێته بناخه‌یه‌کی باش بۆ ڕێکخستن و سه‌قامگیرکردنی شێوه‌ی نووسین.
١. له ڕێنووسدا ئه‌وه‌ی زۆر سه‌رنجی ڕاکێشام به‌کارهێنانی (وو) بوو له سه‌ره‌تای وشه‌دا. به‌ڕاستی من باوه‌ڕ ناکه‌م ئه‌و ده‌نگه‌ی سه‌ره‌تای وشه (وو : wu) بێت، به‌ڵکه هه‌ر (و)ی کۆنسونانته و بزوێنی کورتی

(بزرۆکه)ی به دوادا دێت. به کورتییه‌که‌ی ده‌مه‌وێ بڵێم (ورد، وشک، وتن: wird, wishk, witin) له (ووشک، وورد، ووتن: wurd, wushk, wutin) ڕاستترن. ئێستا به‌داخه‌وه ده‌رفه‌تی ئه‌وه نییه به دووروودرێژی ئه‌م باسه یه‌کالا بکه‌ینه‌وه، به‌ڵام سه‌رنجی ئه‌و وشانه بده‌ی که له فارسیدا شێوه‌ی نزیکیان هه‌یه، یا هاوڕیشه‌ن و به کۆنسونانتێک و بزوێنێک ده‌ست پێ ده‌که‌ن، ده‌بینی هاوماناکانیان له کوردیدا ده‌بن به کۆنسونانتێک و بزوێنی بزرۆکه، که به‌م ڕێنووسه کوردییه نانووسرێت و نیشانه‌ی بۆ دانه‌نراوه. بۆ نموونه (سست: سۆست:sost)ی فارسی بووه‌ته (سست: sist)ی کوردی، هه‌روه‌هایش (دزد: دۆزد، ترش: تۆرش، بردن: بۆرده‌ن، زبان: زه‌بان) که له کوردیدا بوونه‌ته (دز، ترش، بردن، زمان)...هتد. ته‌نانه‌ت ده‌بینین که کوردی باکوور به (تورک) ده‌ڵێن (ترک). مامۆستا سه‌جادی له چیرۆکی "جه‌وهه‌ر ئاغا"دا ده‌ڵێ: "قه‌تاری عه‌زه‌ی حه‌مه ترک به‌ناوبانگ بوو". دیاره من له‌گه‌ڵ ئه‌وه نیم ناوی نه‌ته‌وه‌یه‌ک بگۆڕین، به‌ڵام وشه‌ی ئاسایی شتێکی دیکه‌یه.

٢. نووسینی تیپی (ڕێ) به شێوه‌ی (ر) له سه‌ره‌تای وشه‌دا، واته بێ دانانی نیشانه‌ی (دایاکریتیکاڵ)، ڕه‌نگه به هه‌ڵه نه‌ژمێردرێت، به‌ڵام له ڕووی لۆگیکه‌وه ڕاست نییه. ئێمه ئه‌گه‌ر پێمان وا بێت هه‌ر فۆنێمێک نیشانه‌یه‌کی خۆی هه‌یه، که‌واته ده‌بێ ئیتر (ڕێ)ی قه‌ڵه‌و به‌رۆکی (رێ)ی لاواز به‌ر بدات و شه‌ڕی پێ نه‌فرۆشێت. بۆ کوردێک ئاسانه بزانێ (ڕ) له سه‌ره‌تادا هه‌ر قه‌ڵه‌وه، به‌ڵام که بێگانه‌یه‌ک فێری کوردی ده‌که‌یت، ده‌بێ بڕوای به‌وه‌یش هه‌بێت که ئه‌م سیسته‌می نووسینه ته‌با و گونجاو و (consistent)ه. [حه‌ز ده‌که‌م ئه‌وه‌یشتان له بیر بێت که من ده‌رس به بێگانه ده‌ڵێمه‌وه و ده‌یان جار ڕووبه‌ڕووی ئه‌م پرسیارانه بوومه‌ته‌وه].

٣. له‌باره‌ی ڕێنووسه‌وه پیاو ده‌توانێت زۆر شت باس بکات و لێک بداته‌وه و بخاته ژێر پرسیاره‌وه. له‌م ڕووه‌وه خۆشبه‌ختانه هه‌ندێ کارم کردووه، به‌ڵام له لایه‌که‌وه فریانه‌که‌وتن و له لایه‌کی دیکه‌وه

تەمەڵی و بێبەرنامەیی وای کردووە، تا ئێستا نەمتوانیوە بابەتەکان ڕێک بخەم و لە چوارچێوەیەکی زانستیدا پێشکەشیان بکەم.

٤. لە پێشەکییەکەدا کە باسی شێوەزمانەکە دەکرێت، دەبێ یەکجار زۆر وریا بین کە ئەمە کارێکی وا نەکات زیانی لە قازانجی پتر بێت. منیش دەزانم و تۆیش دەزانیت کە لە بیستەکاندا و بگرە تا ناوەڕاست و کۆتاییی چلەکانیش و ڕەنگە تا بەشێکی پەنجاکانیش، شێوەی سلێمانی بناخەی ئەو زمانە ستانداردە بوو کە کوردی باشوور وەک زمانی ئەدەبی بە کاری هێناوە. بەڵام ئێمە کە باوەڕمان بە گەشەکردنی دیاردەکان هەبێت دەبێ ئەوەیش بزانین کە ئەم زمانە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەگەر بمەوێ هەر بە کورتی ئەمە ڕوون بکەمەوە، دەڵێم ئەو زمانە ئەدەبییە ستانداردەی ئەمڕۆ لە کوردستانی باشوور و بەشێکی باشی کوردستانی ڕۆژهەڵاتیشدا چەسپاوە، پێوەندییەکەی لەگەڵ شێوەی سلێمانیدا تەنیا پێوەندییەکی مێژوویی و تا ڕادەیەک سینتاکسییە، ئەگەرنا ئەمڕۆ زمانێکی ئەدەبیی وا دروست بووە کە لە هەموو زاراوەکانی دیکە (ڤۆکابولێر) و بگرە فۆرمی ڕێزمانیشی وەرگرتووە. ئەمە پەسندان و شانازیکردنە بە زیندوویەتیی زمانەکەوە، بەڵام هیچ (بێوەفایی!) و بەکەمگرتنی شێوەی سلێمانی نییە. من کە باسی زمانی ئەدەبی دەکەم مەبەستم ئەو زمانەیە کە نووسەرە چاک و بەرهەمدار و وریاکان بە کاری دەبەن، ئەگەرنا دەزانم نووسینبازی وا هەیە کە فڕی بەسەر کوردینووسینەوە نییە و زمانەکەیش و بەرهەمەکەیش سەقەت دەکات. ئەمە لە ڕوویەکی دیکەیشەوە زۆر گرنگە و دەبێ (سوعبەت)ی لەگەڵدا نەکەین. بەوەی کە هەر جەخت لەسەر سلێمانیبوونی زمانەکە بکەین، لە لایەکەوە شتێک دەڵێین کە لەگەڵ ڕاستیی ئەمڕۆی زمانەکەدا یەک ناگرێتەوە، لە لایەکی دیکەیشەوە ڕەنگە ببێتە هۆی سڵەمینەوەی گەلێ خەڵکی دەروونتەسک و نائاگا. بەڵام لەوەیش گرنگتر و بقەتر هەڵوێستی نامەردانەی ڕۆژهەڵاتناسان و دەستوپێوەندەکانیانە (دیارە کوردیشیان تێدایە) کە لە خودایان دەوێت قسەیەکی وایان دەست بکەوێت بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی سیاسەتی [divide and rule]ی خۆیاندا

هەڵیسوورێنن. ئەودەم سووک و ئاسان دێت و قسەکەی جەنابت بە نموونە دێنێتەوە و دەیکاتە بەڵگەی (شهد شاهد من أهلها). من کە هێندە لەسەر ئەم باسە دەڕۆم، هۆیەکەی ئەوەیە کە چاک ئاگام لەو باسوخواسە هەیە. ڕەنگە تا ئێستا لە پانزدە بیست کۆنفرانسی گرنگی زانستی و ئەکادێمیدا و لە زۆر وڵاتی ئەم دنیایەدا بەشداریم کردبێت و زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژهەڵاتناسان لە نزیکەوە دەناسم و دەزانم چۆن بیر دەکەنەوە و چی دەڵێن.

حەز دەکەم بە ڕاشکاوی بڵێم کە بە ڕاستی پێم خۆشە فەرهەنگەکە یەک دوو مانگێکیش دوا بخەیت بەو مەرجەی پێشەکییەکە بە جۆرێک دابڕێژیتەوە کە نەک هەر ئەو باسە بەو شێوەیە پێشکەش نەکات، بەڵکە بە تەواوی ئەوە جەخت بکات کە کوردی (هەر نەبێ کوردیی باشوور) بووەتە زمانێکی ستاندارد و بە تێکەڵبوونی زاراواکان ئەم زمانە پێک هاتووە و ئێستا بووەتە کەرەستەیەک (ئامرازێک) کە نێزیکەی هەموو ڕووناکبیر و خوێنەوار و نووسەران و دەستگاکانی ڕاگەیاندنی کورد بە کاری دەهێنن.

پێم وایە جەنابیشت شارەزاییت لە تیۆرییەکانی ستانداردبوونی زماندا هەیە: یەک نۆرم، خوێندن، ماسمیدیا...هتد. ئەگەر ئەوەیش بکەینە پێوانە دیسان زمانی کوردی ڕێگایەکی یەکجار زۆری بڕیوە. چوار ساڵی ١٩٧٠_١٩٧٤ و ئەم ساڵانەی ئێستای کوردستان لەم بوارەدا کاریگەر بوون. [بەینی خۆمان بێت، ئەگەر ئەم دابەشبوونە سیاسی و کارگێڕییەی ئەمڕۆ بەردەوام بێت، هەموو ڕیسەکەمان لێ دەبێتەوە بە خوری و ئەودەم دوو زمانی کوردیی باشوور دروست دەبێت!! خوا بەو ڕۆژەی نەکات. تۆیش بێژە ئامین].

٥. ئەگەر دەرفەتت هەیە، وا چاک دەبێت کورتەیەکی مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردی بگێڕیتەوە، لە (نووبار)ی خانی و (ئەحمەدی)ی شێخی نۆدێوە تا گارزۆنی و ژابا و کوردۆییێڤ و خاڵ و وەهبی و هەژار و زەبیحی و هیی دیکە. ئەمە ئەگەرچی کارێکی باشە، بەڵام زۆر پێویست نییە.

٦. له لیستی ئەلفوبێی کوردیدا فۆنیمی (ئوێ: وێ:Ö) تۆمار نەکراوە. من پێم وایە ئەمە فۆنیمێکی ڕەسەن و سەربەخۆیە. مامۆستا وەهبی زۆر چاکی کردووە کە دوو تیپی (وێ)ی بۆ کردۆتە نیشانە، چونکە ئەو نیشانەیە دەبێتە نوێنەری دیفتۆگی (وێ)یش کە زۆرجار لەگەڵ بزوێنی (وێ)دا تێکەڵ دەکرێن. بۆ نموونە بڕوانە [یا گوێ بگرە لە] دوو وشەی (دوێنێ) و (دەدوێنێ: بە مانای قسەی لەگەڵ دەکات). لە یەکەمیاندا ئەو نیشانەیە نوێنەری [Ö]یە و لە دووەمدا [wê].
٧. لە زۆر جێگادا ڕێزکردنی ئەلفوبێیانە پێڕۆیی نەکراوە. دەبینین کۆنسونانتی سەرەتای وشە، (یـ) و (یێـ) بە نۆرە و بە تێکەڵ دێن. هەروەهایش (ر) و (ڕ)، (ل) و (ڵ). ئەمە ڕەنگە هەر کۆمپوتەر خۆی بتوانێت چارەسەری بکات.

بەداخەوە ئەو لاپەڕانەی ئێوە ناردبووتانن وەرامی هەموو پرسیارەکانی منیان پێ نەدەدرایەوە. هەر بۆ نموونە دەڵێم حەزم دەکرد بزانم مەسەلەی ئەو وشە لێکدراوانەی لە پێشگری (بێ) و ناوێک دروست دەبن چۆن نووسراون: بێوێنە، بێعەقڵ، بێهێز، بێنوێژ، بێماڵ (من وایان دەنووسم)، کە دیارە ئەمە (بێ)ی پریپۆزیشن نییە، بە مانای (بەبێ): تۆ بە بێ ماڵ ناتوانی لەوێ بمێنیتەوە، منداڵ بێ باوک باش گەورە نابێت.
هەر لە بواری وشەی لێکدراودا، لە ڕوونکردنەوەکەی سەرەتادا ئەوەم بۆ ڕوون نەبووەوە وشەی لێکدراو، ئەگەر لە ناوێک و بەشێکی دیکە (غەیری ئاوەڵناو و ئاوەڵکار و ڕەگی ڕانەبردوو کە خۆت باست کردوون) پێک هاتبوو، چۆنی ڕیز دەکەیت: دووگیان، کەرپیاو، تڕەکەڵەک، هەمەکارە...؟ خۆ دەبێ لە بەشی ناوە سەرەکییەکەدا هەر نەبێ ئیشارەتێکی بۆ بکرێت.
هەروەها سەرنجدانی ئەم بابەتانەیش گرنگن:
ئا. نووسینی ڤێربال پریفیکس، یا مۆدال پریفیکسی کرداری ڕانەبردووی indicative بە شێوەی (ئە) سەر لە خوێنەری ئەمڕۆ

دەشێوێنێت، چونکە ئێستا (دە) بووەتە شێوەیەکی ستاندارد: دەڕۆم، دەبینم...

بێ. لە ناساندنی (ێ)دا نووسراوە کە ئامرازی بچووککردنەوەیە و هەندێ شتی دیکەیش، بەڵام نەخشێکی گرنگی (ێ) ئەوەیە کە ئامرازی بانگکردنە vocative بۆ ناوێ مێی تاک: کچێ، خوشکێ، پوورێ. تەنانەت من پێم وایە زۆربەی ناوی ژنان کە لە کوردەواریدا (ێ)ی دەچێتە سەر هەر لەبەر ئەمەیە: نازێ، فاتێ، ئایشێ، حەبێ، خەجێ... یا لە گۆرانیی کوردیدا دەڵێ: سەوزەڵێ.

پێ. هەر لە باسی (ێ)دا نووسراوە کە پریپۆزیشنی ئابسۆلیووتە لەگەڵ کاری (دان)دا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو (ێ)یەی دەکەوێتە دوای چەند کردارێکەوە (نەک تەنیا دان) پریپۆزیشنی داڕێژراوە: derivative و تەنیا لە پریپۆزیشنی (ـە)وە هاتووە، نەک لە (بە) و (پێ)وە، کە (پێ) خۆیشی هەر derivative ی (بە)یە. کەواتە (دەتدەمێ) لە (دەیدەمە تۆ)وە وەرگیراوە، نەک (دەیدەم بە تۆ).

جیم. (ی) ڕاستە کورتکراوەی (یت)ـە کە کۆتایی یا پاشگری کاری ڕانەبوردوو و کاری تێنەپەڕی ڕابوردووە، بەڵام هەروەها کورتکراوەی دووەم کەسی تاکی کاری (بوون)یشە: Copula, verb to be.

چیم. (ی)ی دووەم: جێناو (ڕاناو)ی سێیەم کەسی تاک نییە، بەڵکە ڕاناوی لکاوی سێیەم کەسی تاکە: enclitic pronoun.

حێ. (ێنە) تەنیا [ êne-]یە، نەک [yêne-]، (ێنی)یش تەنیا [ênî-]یە، نەک [-yênî].

خێ. ئەو وشانەی لە زمانی دیکەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە، هەر نەبێ ئەوانەی لە زمانانی ئەورووپاوە، چاکترە دیاری بکرێن و (E) لە بەردەمیاندا بنووسرێت، بۆ نموونە هەموو کەس دەبێ بزانێت (ئابڵووقە) لە زمانانی ئەورووپاوە، لە ڕێگەی تورکییەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردییەوە. نازانم بۆ وشە عەرەبی و فارسی و تورکی و هیندی و ئەرمەنییەکان چی بکرێت باشە، بەڵام دەزانم کارێکی یەکجار سەختە، چونکە دەبێت هەرچی زانستی ئێتیمۆلۆگی هەیە، هەمووی بخەیتە کار، ئەوجاریش کەس ڕازی نابێت. ئەوەیان هەر لێ گەڕێ.

دال. لە سەرەتای تیپی (چ)دا، یەکسەر (چـ) وەک ڕەگی ڕانەبوردووی کاری (چوون) دراوە و هەر لەوێیشەوە یەکسەر (چوون)ی چاوگ دەستی پێ کردووە. پێم وایە چاکتر دەبوو ئەگەر وشەکان هەر بە ڕیزکردنی ئەلفوبێیانە بەردەوام ببوونایە تا نۆرە دەگەیشتە سەر (چوون) خۆی؛ واتە لەنێوان (چـ) و (چوون)دا گەلێ وشەی دیکە هەبوون و هەن، کە نابێت نۆرەبڕیان لێ بکرێت. یا ڕەنگە دەکرا ڕەگی کردارەکە نەدرایە تا دەگەیشتینە چاوگی (چوون) و لەگەڵ ئەودا و لەناو کەوانەدا ڕەگەکەی بدرایە، کە (چـ)ـە، وەک بۆ زۆر کرداری دیکە ئەمە بە کار هێنراوە. ئەودەم ئەو هەموو دووبارەکردنەوەی (ـوون)ـەیش پێویست نەدەبوو.

ڕێ. لە تایپکردنی فەرهەنگەکەدا ژمارەیەک هەڵە بەرچاو دەکەون (کە ڕەنگە بۆ فەرهەنگ کەم نەبن). تەنیا چارەیەک ئەوەیە، ئەگەر بە پرۆگرامی کۆمپوتەر چار نەکرێت، یەک دوو کەس (ی کوردیزان و ئینگلیزیزان) بە وردی پێدا بچنەوە. نووسەر خۆی هەڵەکانی خۆی نابینێت و ئەمە لای هەموومان هەر وایە.

ئەمانە هەندێک بوون لەو تێبینییانەی بە چاوپێداگێڕانی ئەو لاپەڕانەی فەرهەنگەکە بە بیرمدا هاتن. من کە ئەم ڕا و سەرنجانە دەنووسم، دیارە مەبەستی بەرودوام پوخت و ڕێکبوونی کارەکەیە. لەو بڕوایەدام (و ڕەنگە بشتوانم بڵێم دڵنیام) کە جەنابت پیاوێکیت زانستییانە بیر دەکەیتەوە و بە سەرنج و بۆچوونی کەسانی دی (با لەگەڵ ئەوانەی خۆیشتدا نەگونجێن) سەغڵەت نابیت. ئەگەر هەر بەشێکی ئەم سەرنجانەی من شایانی ئەوە بێت پێڕۆیی بکرێت، دیارە سوودی کارەکەی تێدایە و منیش دڵخۆش دەکات. خۆ ئەگەر پێیشت وا بوو هیچ کەلەبەرێک پڕ ناکاتەوە، بە تووڕهەڵدانیان سەغڵەت نابم.

دەمەوێ لێرەیشدا ئەو قسەیەی لە تەلەفۆنەکەدا کردم جەخت بکەمەوە؛ هەبوونی ئەم سەرنجانە بە هیچ جۆرێک لە بایەخ و گرنگیی کارەکە کەم ناکاتەوە. ئێستایش پێم وایە بڵاوبوونەوەی ئەم فەرهەنگە دەبێتە ڕووداوێکی یەکجار گرنگ لە مێژووی فەرهەنگ (ڕووناکبیری)ی کورددا. هەر بۆیەیش حەز دەکەم چاپ و بڵاوبوونەوەی بکەوێتە دوای

بڕانەوەی ئەم ساڵ و سەدەیە، بۆ ئەوەی ببێتە دیارییەکی هێژا بۆ مرۆڤی کورد لە ساڵی (سەدەی، هەزارەی) تازەدا. بە هیوای ئەوەی لە سەرەتای ساڵی تازەدا، کە لەگەڵ جەژنی ڕەمەزانیشدا هاوکات دەبن، چاومان بە بینینی فەرهەنگی شارەزوور ڕوون ببێتەوە.

جارێکی دیکەیش ڕێز و خۆشەویستیم و لە پەنای خوادا بن.

براتان: فەرهاد شاکەلی

# نامەیەک بۆ دۆکتۆر شەفیق قەززاز [٢]

کۆڕی زانیاریی کوردستان پرۆژەیەکیان بە دەستەوە بوو بۆ دانانی کتێبی خوێندن بۆ پۆلەکانی یەکەم و دووەمی سەرەتایی و هەوڵیان دەدا زاراوەکانی کوردیی بادینانی و کوردیی ناوەندی (خواروو) لە تێکستەکاندا تێکەڵ بکەن. کاک دۆکتۆر شەفیق قەززاز، وەک سەرۆکی کۆڕ، نموونەی هەردوو کتێبەکەی بۆ ناردبووم بۆ پێداچوونەوە و دەربڕینی سەرنجەکانم لەبارەیانەوە. ئەم نامەیە وەرامی ئەو داواکارییەی کۆڕە.

سۆللەنتوونا ١-٩-٢٠٠٢

برای بەڕێز و خۆشەویستم مامۆستا شەفیق قەززاز
سەلاوی گەرموگوڕی برایانە بۆ خۆت و ماڵ و منداڵ، هیوام خۆشی و سەربەرزی و بەختەوەریتانە. سەلاوم بۆ هەموو هاوکارانت لە کۆڕی زانیاریی کوردستان، هیوادارم لە کار و ئەرکەکانتاندا سەرکەوتوو بن.

زۆرم پێ خۆش دەبوو ئەگەر ماوە و دەرفەتێکی باشترم بە دەستەوە ببووایە بۆ ئەوەی بە شێنەیی بە تێکستەکاندا بچمەوە و بمتوانیبایە بە شێوەیەکی ڕێکوپێکتر و زانستییانەتر باری سەرنجی خۆم دەرببڕم.
من لەم سەرنجانەمدا نامەوێ خۆم لە قەرەی تیۆرییەکانی زمانەوانی (Linguistics) بدەم، چونکە ئەودەم دەبێ بنەڕەتی هەڵوێست و کار و دەرئەنجامەکان بخەینە ژێر پرسیارەوە. ئەوەیش جێگەی ئێرە نییە، بەو هیوایەی بتوانین لە داهاتوویەکی هەرچی نزیکدا ڕووبەڕوو لەگەڵ هەموو ئەوانەی لە بوارەکانی فەرهەنگ (من لێرەدا فەرهەنگ بەرانبەر بە وشەی Culture بە کار دەبەم) و زمانەوانیدا چالاکن بکەوینە گفتوگۆیەکی بەرهەمدارەوە.
نامەوێ لێتانی بشارمەوە، کە من لای خۆمەوە گەیشتوومەتە سنووری بێهومێدی لەبارەی ڕەوش و هەلومەرجی فەرهەنگییەوە لە کوردستاندا. بەڕاستی دەبێ زۆر وردتر و ژیرانەتر و قووڵتر لەم باسانە بکۆڵرێتەوە، دەنا ئەوەی لە پێشمانەوەیە باوەڕ ناکەم پاشەڕۆژێکی زۆر ورشەدار بێت.
وا پێ دەچێت ئەم دوو تێکستەی بۆ منتان ناردوون سەرەتای ئەزموونێکن بە ئامانجی لێک نزیککردنەوەی دوو دیالێکتە سەرەکییەکەی زمانی کوردی. ئەم هەڵوێست و بۆچوونەیش لەو باوەڕ و قەناعەتەوە هەڵهێنجراوە کە کوردی زمانێکی ستاندارد نییە و دەبێ زمانێکی ستاندارد "دروست بکرێت". ڕێگای هەرە نزیکیش بۆ گەیشتن

بەو ئامانجە وا لێک دراوەتەوە کە بە تێکەڵکردنی وشە و پێکهاتە و ڕێزمان و سینتاکسی ئەو دوو زاراوایە جێبەجێ دەکرێت. ئەم نیازە ئەگەرچی دڵنیام، لای بەشێکی زۆری ئەوانەی کاری بۆ دەکەن، لە دڵسۆزی و خەمخۆرییەوە هەڵقوڵاوە، بەڵام تووشی جۆرێک لە سادەکاری Simplification هاتووە. من وەک عەرزم کردن لەم نامە کورت و سنووردارەدا ناتوانم باسێکی وا گرنگ و قووڵ بێنمە کایەوە و یەکالا بکەمەوە، بەڵام بێ یەکالاکردنەوەی ئەو باسانەیش، یا هەر نەبێت بێ گەیشتنە تێگەیشتنێکی هاوبەشی زانستییانە سەبارەت شێوەی کارکردن و هەنگاونان، پێم وا نییە هەوڵەکانی دیکە بەر بگرن. بۆ ئەوەی سەرنجەکانم بە کورتی، بەڵام بە جۆرێک کە تێگەیشتنیان ئاسان بێت، دەربڕم، ئەو دوو دەستنووسە پێکەوە باس دەکەم. نموونەکان لە پلەی یەکەمدا لە کتێبی ئەلفوبێیەکەوە دەهێنمەوە، ئەگەر پێویست بێت دەچمە سەر (خوێندنەوەی نوێ):

## یەک: لە ڕووی ڕێنووسەوە

١. ناتەواوییەکی ئاشکرای تێکستەکە ڕێنووسە. دیارە ئەمە تەنیا کێشەی کتێبێکی بەستەزمانی وەک ئەم ئەلفوبێیە نییە، بەڵکە سەرجەم گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێبەکانی کوردستان بە هەڵە دەنووسرێن و بەرانبەر ڕەخنەیەکی جیددی و زانستییانە بەرگە ناگرن. بەداخەوە تا ئێستا ئەو هەڵە نەڕەخسێنراوە کە چارەسەرێک دابنرێت، کە بە لای منەوە، چارەسەر ئاسانە.

٢. (ئەلف و بێ) هەڵەیە و (ئەلفوبێ) ڕاستە، چونکە ناوێکی لێکدراوە.

٣. یەکێ لە هەڵە زەقەکان لەم تێکستەدا نەبوونی (ی)ی ئیزافەیە (Genitive) لەگەڵ ئەو ناوانەدا کە خۆیان بە (ی) تەواو دەبن، یا کاتێ ڕاناوی سێیەم کەسی تاک یا کۆیان بە دوادا دێت: (ڕەزامەندیی ئێمەیە) نەک (ڕەزامەندی ئێمەیە)، (قوتابیی خۆشەویست) نەک (قوتابی خۆشەویست)، (یاریی تۆپی...) نەک (یاری تۆپی...)، (یارمەتیی دایکی) نەک (یارمەتی دایکی).

٤. تیپی (ک)ی کۆتایی دەبێ بەو شێوەیە بنووسرێت، نەک بە شێوەی کافی عەرەبی کە کەشیدەکەی سەری لا دەبرێت و هەمزەیەک لەناو سکیدا دادەنرێت.
٥. کە دوو (ی) بە شوێن یەکدیدا هاتن دەتوانین پێکەوەیان بنووسین ئەگەر ڕێگرێکی ڕێزمانی نەبێت: (یارییان) ڕاستە نەک (یاری یان)، (کێیە) ڕاستە نەک (کێ یە)، (بچییە) ڕاستە نەک (بچی یە).
٦. پریپۆزیشن (حرف جر) دەبێ بە جودا بنووسرێت: (بەئاسماندا) هەڵەیە و (بە ئاسماندا) ڕاستە، (بەکەف) هەڵەیە و (بە کەف) ڕاستە.
٧. پۆستپۆزیشن دەبێ لەگەڵ وشەی پێش خۆیدا بنووسرێت نەک بە جیا: (زەلکاوەکیدا) ڕاستە نەک (زەلکاوەکی دا).
٨. کاری لێکدراو لە گەردانکردندا دەبێ جیا بکرێتەوە (چەند کارێکی تایبەی نەبێت): (لێدەدەم) هەڵەیە و (لێ دەدەم) ڕاستە، (پڕ بوویە) نەک (پڕبوویە)، (خۆش دەبێت) نەک (خۆشدەبێت).
٩. ئاوەڵکار دەبێ بە جیا و سەربەخۆ بنووسرێت: (هەر وایە) نەک (هەروایە).
١٠. (دەنگخۆش) ڕاستە نەک (دەنگ خۆش).

## دوو: لە ڕووی پێداگۆگییەوە

١. هەوڵ دراوە وشەکان بەپێی بنەمای بڕگە دابەش یا کەرت بکرێن، بەڵام گەلێ جار ئەمە بە هەڵە ئەنجام دراوە. ئێمە دەزانین بڕگە دەتوانێت لە ڕێکخستنی کۆنسونانت و بزوێنەکان (ڤاوڵ، ڤۆکال) پێک بێت: یەک بزوێن، بزوێنێک و کۆنسونانتێک، کۆنسونانتێک و بزوێنێک، کۆنسونانت و بزوێن و کۆنسونانت، کۆنسونانت و بزوێن و دوو کۆنسونانت...هتد.

(دەریاز) کراوە بە سێ بڕگە (دەر – یا – ز). ڕاستییەکەی (دەر – یاز)ە. (دڕ) یەک بڕگەیە نەک (د) و (ڕ). (ڕۆژ) یەک بڕگەیە نەک (ڕۆ) و (ژ). هەروەها (دان)، (رین)، (رام)، (راب)، (بان)، (وات)، (تەڕ)، (ئاڤ)، (سەگ)، (راس)، (ساج)، (هرچ)، (باش) و دەیان نموونەی دیکە.

## سێ: لە ڕووی ڕێزمانەوە

١. کرداری تێنەپەڕی ئیندیکاتیڤ بە شێوەیەک گەردان کراوە کە لە ڕووی ڕێزمانەوە تێنەگەیشتنێکی سەرسووڕهێن دروست دەکات. ئەم ڕەوشە لە بەشە زاراوەی بادینانی سەر بە کرمانجیی ژووروودا هەیە، بەڵام بۆچی دەبێ بکرێتە بار بەسەر زمانی ئەدەبییەوە کە نەک نابێتە هۆی دەوڵەمەندکردنی، بەڵکە دەبێتە هۆی ئاژاوە و گێچەڵ بۆ منداڵێکی بەستەزمان کە هێشتا سەرەتا سادە و ساکارەکانی زمان تێنەگەیشتووە:

(دەوەڕی) بۆ (زۆرۆ)ی سەگ بە کار هاتووە، بەڵام ئەم داڕێشتنە هەردوو ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک (3 sg.) و دووەمی تاکیش (2 sg.) دەگرێتەوە. لەوەیش بترازێت، لەم کردارەدا ئەو گەردانکردنە مەعنای ڕابوردووی بەردەوام بۆ سێیەم کەسی تاکیش دەدات. (دپێژیت)، ئەو (وێ) دپێژیت و تو (تۆ) دپێژیت. (خوونا مە پاکژ دبیت) لێرەدا (دبیت) دەکرێت بۆ دوو کەسی جیاواز بخرێتە کار.

٢. ئامرازی گەیاندن (Conjunction) دەبێ سەربەخۆ و بە جیا بنووسرێت: (دلڤەکەرو خەمرەوینە) چەوتە و (دلڤەکەر و خەمرەوینە) ڕاستە.

٣. پاستپارتیسیپ (past participle) دەبێ شێوەی ستانداردی خۆی وەرگرێت: (ماندوو) نەک (ماندی)، (خواردووە) نەک (خواردییە).

٤. لە کرمانجیدا دۆخێک هەیە لە زمانەوانیدا پێی دەگوترێت ( Oblique Case)، کە خوالێخۆشبوو قەناتێ کوردۆ پێی دەگوت (تەوان) کە دیارە لە (طوي)ی عەرەبییەوە هاتووە. زۆربەی هەرە زۆری نووسەرانی کرمانجیی سەروو، بە بەشی بادینانیشەوە، لە بەکارهێنانیدا هەڵە دەکەن، یا با بڵێین کەمتەرخەمی دەکەن، چونکە گەوهەری بەکارهێنانەکە مەسەلەی جێندەرە (Gender, Genus)، بەڵام ئەو شێوەیەی ئەوان بە کاری دەبەن، جێندەر سەری تێدا دەچێت و خوێنەریش تووشی سەرگێژی دەبێت. من لێرەدا لەوە زیاترم بۆ ناگوترێت، چێترە نموونە بدەم:

لە جێی (ئەم ب مۆسیقیێ...) چاکترە بگوترێ (ئەم ب مۆسیقاییێ...)، (وەزارەتی پەرەوەردەییێ) ڕاستە نەک (وەزارەتی پەروەردێ)، (برایی خو) ڕاستە نەک (برێ خو).

٥. شتێکی باشە کە کاتی داهاتوو (Futurum)ی کرمانجی هێنراوەتە ناو تێکستەکانەوە، بەڵام لە دەرسی (ئاوات)دا (دێ باریت) لەگەڵ (دا تەڕ نەبی)دا یەک ناگرێتەوە.

## چوار: لە ڕووی وشەگەلەوە Vocabulary

١. هەندێ وشە ئەگەرچی لە ناوچەیەک بە شێوەیەکی تایبەت دەگوترێت و دەنووسرێت، بەڵام ئەمە نابێ لەسەر حیسابی ڕاستیی ڕەسەنی وشە، یا جوانیی ئێستەتیکی بێت:

(ڕحانە) چەوتە و (ڕەیحانە، ڕەیحان، ڕێحان) ڕاستترن. (دیکل) وشەیەکی ناشیرینە و چێترە (کەڵەباب) یا (کەڵەشێر) بە کار ببرێت.

## پێنج: فۆنۆلۆگی

١. دەنگی بزوێنی واوی درێژ (وو) لە بادیناندا دو گۆڕانی بەسەردا هاتووە: لە (وو)وەوە بووە بە (وی)، لەویشەوە بووە بە (ی): مزووری: مزویری: مزیری، مژوول: مژویل: مژیل، مەیموون: مەیموین: مەیمینک، نامووس: نامویس: نامیس، نووخاز: نویخاز، نیخاز. ئەم گۆڕانە پێویست ناکات بهێنرێتە ناو زمانی نووسینەوە. شێوەی هەرە ڕاست دەنگی (وو) بپارێزرێت، واتە (مژوول، مزووری...هتد).

## شەش: لایەنی دیکە

١. لاپەڕە (٨٤) لەپڕ باسی دوو سوار دەکرێ، کە سواری دوو وڵاغی ڕەش بوونە. ئەمە یەکسەر بە دوای باسی قەلەڕەشدا دێت، دیارە هەڵەیە.

٢. (چیڕۆک) هەڵەیە و (چیرۆک) ڕاستە، (سوپاسا تە دکەین) نەک (سوپاسیا تە...).

٣. (وەرنە مێوژان) دەربڕینێکی ناشیرینە.
٢. بەشێک لە شیعرەکان لە ڕووی کێشەوە هەڵەیان تێدایە، هەندێکیان هەر زۆر بێتام و لاوازن، بۆ نموونە شیعری (نوێخوازی) و شیعری (کۆترکێ پەڕنەخشینێ).
٣. لە لاپەڕە (٣٢)ی خوێندنەوەدا جێندەر بە هەڵە بە کار هێنراوە. (مریشک) مێیە [بە هەر حاڵ تا ئەم ساڵانەی دواییش وا بوو!]، کەچی نووسراوە (هێکێن مریشکێ خۆ)، کە ئەگەر مەبەست یەک مریشکە دەبوو بنووسرێت (مریشکا خۆ)، ئەگەریش مەبەست هەر سێ مریشکەکانە دەبوو بگوترێت (هێکێن مریشکێن خۆ).
٤. (لەناکاو مارەکی کیفاند و گۆتی)، ئەمە ڕێزمانی هیچ دیالێکتێک نایگرێتەوە و دەبوو بە شێوەیەکی ڕاستتر دابڕێژرێت.
٥. (دەلوورێت) هەڵەیە و (دەلوورێنێت) ڕاستە.
٦. (قیرەی لێ هێنا) هەڵەیە و (قیرەی بڕی) ڕاستترە.

نامەوێ لەمە زیاتر خۆیشم و ئێوەیش بە وردەکارییەوە خەریک بکەم. وەک لە سەرەتایشەوە باسم کرد، ئەم هەنگاوە بەشێکە لە بیرکردنەوەیەک سەبارەت زمان و بەتایبەت زمانی کوردی کە ڕەنگە بکرێ هەر بنەڕەتە فەلسەفی و فەرهەنگییەکانی (ڕووناکبیرییەکانی) بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە، هیوادارم لە دەرفەتێکی نێزیکی داهاتوودا شێوەیەک بدۆزرێتەوە بۆ لەیەکدیگەیشتنێکی پێویست و ڕاست.

جارێکی دیکەیش ڕێز و خۆشەویستیم بۆ هەموو دۆست و ئاشنایان

هەر بژین

براتان: فەرهاد شاکەلی

# سەرێشەیەکی ناپێویست
## بۆ گۆڤاری گوڵان

دەمێکە ئەوە دەزانم کە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستان ئەوەی ڕێزمان و ڕێنووسی کوردی بێت سەریان لێ دەرناچێت. بار و دۆخی زمان بە جۆرێک داتەپیوە کە نە نیازی پاکان و نە نزای چاکان نایێت بە هانایەوە. زۆرم حەز دەکرد لەم ڕووەوە "دەستێ بدەمە دەستیان".
لە بەر ئەمیان پاڕامەوە و دەستەوداوێنی ئەویان بووم، بەڵام دادی نەدا. دەڵێی سوێندیان خواردووە هەتا لاڕێ هەبێت و تا پێچەڵپێچ دەست بکەوێت، ملی ڕاستەڕێیەک نەگرن.
کەلێنێکی دیکەی ڕۆژنامەگەریی کوردستان، کە من زۆر ئاگاداری نیم، (ئێتیک)ی ڕۆژنامەگەرییە، کە دەکرێ بە کوردییەکەی خۆمان پێی بڵێین (ڕەوشت)، (دەستپاکی) یا (ئەمانەت). ڕۆژنامەیەک یا ڕۆژنامەوانێک ڕێزی بەڵێنی خۆی نەگرێت، نە ڕێزی نووسەر دەگرێت، نە هیی خوێنەر و نە هیی ڕۆژنامەکەی خۆیشی.
چارەسەری ئەم دەردانە کارێکی نەکراو نییە، بەڵام هەروایش لە خۆیەوە بنبڕ نابێت. تۆ دەبێ لە بنەماکانی بەکارهێنانی ڕێنووس بگەیت، ئەوسا دەتوانیت ڕاست بنووسیت. هەتا ڕێزمانیش تێنەگەیت، نازانی ڕێنووس بەری ج دارێکە، بنچکی چ هەرد و بنارێکە. کەسێ یەک تۆز، هێندەی سەرەدەرزییەک، "میزاجی کوردەواری"ی هەبێت چۆن دەتوانێت ئەم کوردییەی گوێ لێ بێت یا بخوێنێتەوە و لە داخانا دەهری نەبێت و نەداتە ئەو کێوانە:
خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی فلان...
لە گرمەی جەنگی دووەمدا
لە هەندەراندا دەژی
لای ئێمەدا هونەر نرخی نییە
بە گڕ خستنی هەڵمەتێک
لە کەرکووک دایە...

ئەمە مەسەلەی بۆچوون و ئیجتیهاد نییە؛ ڕاست هەیە و ناڕاست هەیە. ئەگەر لە سادەترین بنەماکانی زمانەوانی دەگەیت، فەرموو با قسەی لێ بکەین، یا تۆ تێم بگەیێنە کە هەڵەم، ئەودەم من ئامادەم واز لە هەڵەکەی خۆم بهێنم، یا ئەوەتا من بۆ جەنابتی ڕوون دەکەمەوە ئەوەی تۆ دەینووسی ناڕاستە، ئەوجا تۆ وەک پیاوێکی پیاوانە پێی لێ بنێ و دینی من کامە، بیرە سەر دینم. دەڵێی چی؟ گرەو بکەین؟

وام دەزانی دەستگا زانستی و زمانەوانییەکانی کوردستان دەتوانن ڕێنوێنییەک بکەن و داریٚ بخەنە سەر بەردێ. ڕووم لە هەر لایەکیان دەکرد، هانام وەبەر هەر ڕیشسپی و هەر دەمڕاست و سەرۆکێکیان دەبرد، گوێی دادەخست و خۆی لێ نەبان دەکرد. ئەوسا زانیم "ئەگەر کەچەڵ حەکیم بووایە...".

کێشەی هەرە گەورەی من لەگەڵ چاپەمەنییەکانی کوردستاندا ئەوەیە کە شارەزای ڕێزمان و ڕێنووس و خاڵبەندی نین. با جاریٚ شێوازی ناڕەوانی دەربڕین و کوردیی ئاخرزەمان و ئێستێتیکی ڕووپەڕ دامەزراندنیش لەولاوە بوەستێ. لەبەر ئەوە ناچارم هەمیشە ئەوە جەخت بکەم کە دەمەوێ بە دەستی خۆم تیکستەکانی خۆم هەڵەبژێر بکەم. ئەم جارەیان بۆ بەدبەختی لەگەڵ (گولان)، باسەکەمان بە بەڵێن و پەیمانشکێنی شکایەوە. بە بەرچاوی چوار گەواهی سپ و ساغ و هۆشیارەوە پەیمانمان بەست، بەڵام هەر زوو پەیمانی هەڵوەشاندەوە و دەستنوێژەکەی شکاندەوە. لە کات و ساتێکی وەهادا چیم لە دەست دێت، ئەوە نەبێ لەگەڵ شێخی گەورەدا بڵێم:

وەختێ کە لەم موعامەلە زانیم غەرەز چییە

دەرحاڵ گەڕامە پاشەوە ئەمما بە عاجزی.

# ئەززمان، وەما ئەدراکە مەززمان؟

بۆ سەرنووسەری هەفتەنامەی هاوڵاتی
(و هەموو سەرنووسەرانی کوردستان)

بریا هەر لە سەرەتاوە دەستت بنایە بە ڕوومەوە و وتارەکەت بۆ بڵاو نەکردمایەتەوە. ئەودەم نە من وەک ئێستا دەهری دەبووم و نە تۆیش تاوانی شێواندنی تێکستێکی کوردیت دەدرایە پاڵ. جارێ با هەر پێشەکی عەرزت بکەم کە من لە مافی خۆم خۆش بووم و گەردنت سەد جار ئازاد بێت. هەرچییەکیش لێرە بە دواوە بیڵێم (بینووسم) دەچێتە خانەی ئەو گوتوبێژە گشتییانەوە کە بازنەی سوودی لەو دوو کەسەی ڕووبەڕووی یەک دەدوێن زۆر بەولاوەتر دەچێت. ئەمەیان ئیدی بەشێکە لەو هاوپرسەکییانەی ئەگەر بە ڕێگەی زانستییانە ئەنجام بدرێن، دەبنە هۆی دەوڵەمەندکردنی بیر و فەرهەنگ و زمان.

گوتاری (ئەم هەڵوێستبازانە جێی متمانە نین)، پێش ئەوەی بگاتە لای ئێوە بە لای کەمەوە دە جار (باوەڕ بفەرموون!) خوێنراوەتەوە، هەڵبژێر کراوە و ڕاست کراوەتەوە. کەچی لە (هاوڵاتی!!)دا کۆمەڵێ هەڵەی ڕێنووس و ئێستێتیکی و شێوازەکی کراون بە قردێلە و دراون لە پەرچەم و ئەگریجەی جاران خاوی.

من ئێستا نایێم ئێوە و خوێنەران و خۆیشم بە باسی سەرلەبەری ئەو هەڵانەوە خەریک بکەم، بەڵکە تەنیا سێ جۆر، وەک نموونە، هەڵدەبژێرم:

دواوشەی ناوی گوتارەکە ئاوەها نووسراوە: نیین. ئەم (نین)ە لە ڕێزماندا پێی دەگوترێت کرداری نەفیکراوی بوون(Negative copula) ، کە لە کوردیدا لە ئامرازی نەفی (نی) و کرداری (بوون) دروست دەبێت و بەگوێرەی کەسەکان گەردان دەکرێت. کرداری بوون لە کوردیدا بۆ شەش کەسەکەی ڕێزمان لە شێوەی جەختکراویدا ئاوایە (م، یت، ە، ین، ن، ن). تۆ دەڵێیت: من کوردم، تۆ کوردیت، ئەو کوردە،

ئێمە کوردین، ئێوە/ئەوان کوردن. بۆ نەفیکردنیش تەنیا (نی) دەچێتە سەر ئەو شێوانە. کەواتە دەبێ بڵێین: (ئێمە کوردین) یا (ئێمە کورد نیین)، بەڵام ئەگەر باسی (ئێوە) یا (ئەوان)مان کرد دەڵێین (کوردن) یا (کورد نین). ئەگەر مەبەست باسی (ئێمەی هەڵوێستباز) ببووایە، دەکرا بنووسرێ (ئێمە جێی متمانە نیین). بەڵام کە ئێمە باسی (ئەوانی هەڵوێستباز) دەکەین، دەبێ بنووسرێت (جێی متمانە نین). ئەمە هەڵەیەکی ڕێزمانییە لەو بابەتەی هیچ دەمەتەقێ و (ئیجتیهاد)ێک هەڵناگرێت و تەنیا ئەو ڕوونکردنەوەیەی لێرەدا پێشکەشم کردووە دەتوانێت ڕاست بێت و هیچ باوەڕ و هەڵوێست و بۆچوونێکی دیکەی جیاواز ناتوانێ و ناکرێ ڕاست بێت.

پێم وایە لە بەشی هەرە زۆری گوتارەکەدا (ڕ) ی قەڵەو گۆڕاوە و کراوە بە (ر)ی لاواز. من ئەمەم بە کاری ڕووخێنەرانەی تەکنیک لێک دایەوە، کە ڕەنگە لەبەر جیاوازیی پرۆگرامی نووسین یا جۆری تیپەکان ئەمە ڕووی دابێت. بەڵام هاوکاتیش دەبینم لە هەندێ جێگەدا (ڕ)ی قەڵەو وەک خۆی ماوەتەوە. ئەمەیان چۆن پاساو دەدرێت؟ نازانم.

لە بڕگەیەکدا من تێرمی (بەرگەنەگرتوو)م بە کار بردووە، کەچی ئێوە زۆر خەمساردانە کردووتانە بە (بەرنەگرتوو). تۆ بڵێی من نەزانم (بەرنەگرتوو) لە کوردیدا هەیە؟ با، بەڵام ئەوەیشم لا ڕوونە کە بە (واسیتە)ی هیچ دەستەڵاتدارێک و بە (فەرمان)ی هیچ سەرکردەیەکیش لەو ڕستەیەدا جێی نابێتەوە! ئەمە پێش ئەوەی هەڵەیەکی زمانەوانی بێت، هەڵەیەکی ئێستێتیکییە، پێوەندیی بە چێژی زمانەوانی و فەرهەنگییەوە هەیە.

ئەو سێ خاڵەی سەرەوە تەنیا سێ نموونەی سادەی هەڵەی ڕێزمان، ڕێنووس و ئێستێتیکن. من مەبەستم ئەوە نییە، خوانەخواستە، هەرچی کاسە و کەوێڵی هەڵە و ناتەواوییەکانی زمانی کوردییە بکێشم بە سەروپۆتەلاکی ئێوەدا و ورد و خاشیان بکەم.

کارەساتی زمانی کوردی زۆر لەوە قووڵترە بە کورتەڕەخنەیەکی وەها چارەسەر بکرێت. ئەوە دە ساڵ زیاترە من لە هەوڵی ئەوەدام

دەستەڵاتی سیاسیی کوردستان تێ بگەیێنم کە دەبێ ئەم ئاژاوەیە سنوورێکی بۆ دابنرێت و ئەمە کارێکی لەکردننەهاتوو نییە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەوان، وەک لە گوتارەکەیشدا نووسیومە، نە تێی دەگەن و نە دەیانەوێ تێی بگەن .

ئەگەر ڕێگام بدەن ئەم دەرفەتە بۆ ئەوە دەقۆزمەوە هەندێ ڕاستیی تاڵ لێرەدا تۆمار بکەم، کە کەمجار وا ڕێک دەکەوێت پیاو بواری ئەوەی هەبێت ڕاشکاوانە پێشکەشیان بکات. کوردستانی خواروو، لەبەر کۆمەڵێ هۆی سیاسی و مێژوویی، لە هەموو کورستاندا گرنگترین و دەوڵەمەندترین ناوەندی فەرهەنگ و زمانی کوردییە. ئەم ناوەندە سەرەکی و دەوڵەمەندە، ئەگەر هەر وەک ئەم چواردە ساڵەی ڕابوردوو لە گۆڕاندا بێت، دەبێتە گەورەترین سەرچاوەی پووکانەوە و هەڵوەشانەوە و لەناوچوونی زمان و فەرهەنگی کورد. بەرەنگاربوونەوەی ئەم هەڕەشە گەورەیە ئاسان نییە، بەڵام پێویستی بە پەرجوو (معجزە)یەکیش نییە. دەستەڵاتێکی سیاسیی یەکگرتوو، دڵسۆز و بوێر، ئێلیتێکی هۆشیار و زانستپەروەر و ماندوویینەناس، ڕێگەی کارکردنی پێ بدرێت و لە ڕووی ماددی و سیاسی و مەعنەوییەوە پشتگری بکرێت، نەخشەیەکی تۆکمە و زانستییانە لە چوارچێوەی سیاسەتێکی فەرهەنگیدا (Cultural policy). ئەمە ئەو دەرمانەیە کە شێرپەنجە و ئایدزی زمان و فەرهەنگی کوردی تیمار دەکات.

لە سەرەتادا پەنجەیەکم بۆ گرفتی ڕێزمان و ڕێنووس ڕاکێشا. چارەسەری ئەم دوو پەتایە ڕەنگە لە ئەرکە هەرە ئاسانەکانی زمان و فەرهەنگی کورد بێت. بێ زانینی ڕێزمان تۆ ناتوانیت فێری ڕاستنووسی، واتە ڕێنووس، ببیت. لە وڵاتی ئێمەدا ڕێزمان نەبووەتە زانستێکی گەلەکی. هەر لە بنەڕەتیشدا زمانزان و ڕێزمانزانمان یەکجار کەمن. ئەنجامە تاڵ و ئاوەزهەژێنەکە ئەوەیە کە لە کوردستاندا یەک دانە کتێب نییە ڕاست نووسرابێت، یەک دانە ڕۆژنامە و حەوتەنامە و مانگنامە و وەرزنامە نییە کوردی بە شێوەیەکی ڕاست بنووسێت. من کە باسی (ڕاست و چەوت) دەکەم، هەرگیز بە لای ئەو بابەتانەدا ناچم

که دەکرێ باوەڕ و هەڵوێستی جیاوازمان لەبارەیەوە هەبێت. مەبەستم تەنیا ئەو بابەتانەیە کە هیچ ئەملاوئەولای تێدا نییە: یا من ڕاستم یا تۆ. لەم نێوانەدا ئەو بنەمایەیش دەخەمە کارەوە کە ئەگەر تۆ دەتوانیت بە شێوەیەکی زانستی و لۆگیکی قەناعەت بە من بکەی کە هەڵەم، بەڵێنت دەدەمێ کە واز لە بۆچوونەکەی خۆم بێنم، بەڵام ئەگەر من بۆ تۆم ڕوون کردەوە کە هەڵەیت تۆیش ئەو بەڵێنە بدە.

کوردی و کوردیزانی، زمان و زمانزانی و ڕاستنووسی لە سەرێکەوە هەتا بڵێی تێکەڵاوی یەکترن، بەڵام لە سەرێکی دیکەیشەوە تا ئەو ڕادەیە جیاوازن کە دەکرێ بڵێی هەر یەکەیان زانست و بابەتێکی سەربەخۆیە. ئێمە نووسەری وامان هەیە کە کوردییەکی هێندە جوان و پاراو دەنووسێت، پیاو حەز دەکات ئەگەر جنێویشی پێ بدرێت بەو زمانە پێی بدرێت. بەڵام نە شارەزای ڕێزمانن و نە ئاشنای ڕێنووس. زمانزانیشمان هەن، ئەگەرچی زۆر کەمن، کە هەموو بنەماکانی زمانەوانی (Linguistics, philology) یان ڕەوان کردووە، بەڵام ئەگەر دوو لاپەڕەیان بە کوردی نووسی دەبێ بیبەیتە لای فەقێیەکی دێ بۆیان ڕاست بکاتەوە و بیکاتە کوردی. دەردی ڕێنووس لە هەموویان سەختترە. ئەمەیان بێجگە لە مەرجی کوردیزانی و زمانزانی پێویستی بە سەلیقەیەکی کوردانە، ئاشنایەتی لەگەڵ ڕەگوڕیشە و مێژووی وشە (Etymology)، وردبینی و هەستەوەرییەکی خۆڕسک و ئاوەزێکی زانستپەژێر هەیە.

لە بەردەم وێنەیەکی ئاوا تاریک و تەماویدا دەبێ چاوەڕێی چی لە دەستەڵاتدارانی نیشتمانەکەمان بکەین؟ ئەی دەبێ بە نووسەران و ڕووناکبیرانی نەتەوەکەمان بڵێین چی و چۆنیان مۆچیاری بکەین؟ من نامەوێ بدەم لە بنی هەمانەکە، بەڵام لێتانیشی ناشێرمەوە کە خەریکم دەگەمە لێواری بێهومێدی (دەزانم ئێستا بەرانبەر ئەو تانیش و شێرمەوە و هومێدە ڕادەچڵەکێن!) و لێم عەیانە ئەم ئەرکە، گەرچی سەختیش نییە، بەڵام ڕەنجی فەرهادی کێوکەنی دەوێ.

گەل و نەتەوە و تاکەکەسیش لە زۆر ڕووەوە لە یەک دەچن. کەسێکی نەزان، ئەگەر بە خۆی زانی کە نەزانە، لێی مەترسە، چونکە ئەوە

یەکەم هەنگاوی فێربوونە. بەڵام کەسێک کە نەزان بوو، نەشیزانی نەزانە، لەوەیش بەدبەختانەتر وای زانی زانایە، دەستی لێ بشۆ. کە ئەمە دەنووسم ئەو بیرە ساتیرئاسا و کۆمیتراجیدییەم دێتەوە بیر کە چەند ساڵێک لەمەوپێش لەناو کۆلکەخوێندەواری کوردستانی تورکیادا تەشەنەی کردبوو، پرۆفیسۆرێکی بەناو ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسیش ختووکەی ئاوەزی دەدان و کڵاوی زانستی لەسەر دەکردن. ئەودەم، ڕەنگە ئێستایش، پێیان وا بوو کە ئەو کەمە خوێندەوارییەی خەریک بوون فێری دەبوون، جۆرێک ڕێنیسانسە لە مێژووی فەرهەنگی کوردیدا ڕوو دەدات! ئەم زڕەبیرەیان چەند جاران دووپات دەکردەوە و دەنووسی. کار گەیشتبووە ئەوەی دەیانویست ئەنسیکلۆپیدیایەک بە زمانی کوردی (هەڵبەتە بە زاراوی کرمانجی) بنووسن. جا وەرە ئەم وێنە پێکەنینهێنە گاڵتەجاڕە بهێنە بە بەرچاوی خۆتدا: ئەنسیکلۆپیدیایەک بە زاراوای کورمانجی و بە ئەلفوبێی کەمالیستانەی ئەتاتورکانەی لاتینی. سەرۆکی ئەم پرۆژە شارستانییەیش کۆنە سیاسەتمەدارێک بوو کە بە هەموو ژیانی هیچ زاراوایەکی کوردیی نەزانیوە و نازانێت. ئەمە وێناکردنی تەواوی گەندەبیری خۆنەناسینە، کە ئێمەی کورد وەک تاکەکەس و وەک نەتەوەیش تووشی بووینە.

من کە گوتاری (ئەم هەڵوێستبازانە جێی متمانە نین)م بۆ هاووڵاتی نارد، ڕاستییەکەی دەمویست بیکەمە سەرەتای زنجیرەنووسینێک لەسەر ژیانی فەرهەنگیی ئەمڕۆی کوردستان و هەر لەو پێوەندەیشدا ڕۆڵی ڕووناکبیران و (پێوەندیی ناشەرعی)یان لەگەڵ دەستەڵاتدا بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە بخوێنمەوە. بەڵام شێواندنی نووسینەکەم بوو بە هۆی ئەوەی جارێکی دیکەیش بیری لێ بکەمەوە و بە دوای چارەیەکدا بگەڕێم. ئەو گوتارە پەیامێکی دیاریکراوی پێ بوو، کە دەمویست بگاتە بەر چاو و ئاوەزی بەشێکی باشی خوێنەری کورد، بەڵام کە پەیام وەک خۆی نەگات، ڕەنگە نەناردنی چاکتر بێت.

سوێد، سۆللەنتونا ٢٠٠٥-٥-٢٩

# هەرزانە بێ موبالەغە حەرفی بە گەوهەرێ

هەتا ڕاپەڕینی ١٩٩١ی کورد لە باشووری کوردستان، ئەگەر شێواوی و بێسەروبەری لە ڕێزمان و ڕێنووسی کوردیدا هەبوو، تاوانی ئەم کەمایەسییەمان دەخستە پاڵ بێدەوڵەتی و نەبوونی کورد لە ناوەندی دەسەڵات و بڕیارداندا. ئەمڕۆ ئیتر کورد بۆ هەبوون و هێشتا مانەوەی ئەو کەمایەسییە ناتوانێ بیانوویەکی هەبێ، لەبەر ئەوە خۆی ئەو دەستەڵاتەی هەیە هەر چەشنە هەنگاوێک لەپێناو پوختەکردن و ستانداردکردنی زمانەکەیدا هەڵبێنێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، دەبینین کەموکووڕییەکانی ڕابوردوو نەک هەر ماون، بەڵکە لە ماوەی ئەم چواردە ساڵەدا چەند هێندەی تریان هاتوونەتە سەر.

فەرهاد شاکەلی، مامۆستای زمانی کوردی لە زانستگەی ئوپسالا لە سوید، لە وتارێکدا کە ناوی (ئەززمان وەمائەدراکە مەززمان) بوو، لە ژمارەی ٢٢٧ی (هاوڵاتی)دا دەڵێ: «کوردستانی خواروو، لەبەر کۆمەڵێ هۆی سیاسی و مێژوویی، لە هەموو کوردستاندا گرنگترین و دەوڵەمەندترین ناوەندی فەرهەنگ و زمانی کوردییە. ئەم ناوەندە سەرەکی و دەوڵەمەندە، ئەگەر هەر وەک ئەم چواردە ساڵەی ڕابوردوو لە گۆڕاندا بێت، دەبێتە گەورەترین سەرچاوەی پووکانەوە و هەڵوەشانەوە و لەناوچوونی زمان و فەرهەنگی کورد.»

بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکار و تایبەتمەندییەکانی ئەم گۆڕانکارییە و هەروەها داهاتووی زمان و فەرهەنگی کوردی، بە باشم زانی ڕووی پرسیار بکەمە فەرهاد شاکەلی و داوای لێ بکەم لەم بارەیەوە بۆمان بدوێ.

م. ئەحمەدی (بەڕێوەبەری ماڵپەڕی دیمانە)

دیمانە: کاک فەرهاد، حەز دەکەم لەو دەربڕینەی خۆتەوە دەست پێ بکەی کە لە هاوولاتیدا بڵاو کراوەتەوە. لە تێڕوانینی تۆدا ئەو کەموکووڕی یان شتگەلە چین کە دەبنە هۆکار بۆ "پووکانەوە و هەڵوەشانەوە و لەناوچوونی زمان و فەرهەنگی کوردی"؟

شاکەلی: بەکارهێنانی زمان لە ئاست و پلەی جیاوازدایە و بەپێی گەشەکردنی تاک و کۆمەڵ لە ڕووی فکری و شارستانی و ئابووری و فەرهەنگییەوە دەگۆڕێت. کەسێک کە پیشەیەکی ساکاری هەیە و ژیانێکی زۆر سادە دەژی پێویستی بەوە نییە زمانێکی دەوڵەمەندی پڕ لە تێرم و زاراوەی فەلسەفی و سیاسی و تەکنیکی بخاتە گەڕ. ئەو تەنیا لە چوارچێوەی پێویستییە ڕۆژانەکانی خۆیدا زمانی پێویستە. تەنانەت بۆ دەربڕینی هەست و بیرە ناسک و دەروونییەکانی خۆیشی وێنەی زۆر سادە و یەکتوێژی بە کار دەهێنێت. بەڵام کاتێ کۆمەڵگە، کاتێ نەتەوە بە ڕێگای شارستانێتی و پێشکەوتنی فەرهەنگی و سیاسی و ئابووریدا دەڕوات، ئیدی پێویستییەکانی ڕۆژبەڕۆژ ڕوو لە زیادبوون دەچێت و ناتوانێت هەر بەو کۆمەڵە وشە و تێرم و دەربڕین و دەستەواژەیەی جاران خۆی ببا بە ڕێوە. ڕەنگە بەپێی تیۆریی مارکسیزم ئەمە ببەسترێتەوە بە گۆڕانی یاساکانی کارەوە و تەفسیرێکی ماددی بکرێت، بەڵام کۆمەڵگە و تاکەکەس و ژیان تەنیا بە ماددە تەفسیر ناکرێت.
لە کوردستانی باشوور (حەز دەکەی بڵێ کوردستانی عیراق، یا باشووری کوردستان، ئێستا کارم بەوە نییە)، کۆمەڵگە لە گۆڕانێکی بنەڕەتی و قووڵدایە. ئەم گۆڕانە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کۆمەڵێ پێویستی و کۆمەڵێ یاسای ناچاری و کۆمەڵێ بنەما و شێوەی تازەی کار و بیرکردنەوە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ. گرێکوێرەی باسەکەمان لێرەوە دەست پێ دەکات. لە کۆمەڵگایەکدا کە زانست و فکر و عەقڵ سەردەست بێت، ئەوانەی دەیبەن بە ڕێوە یا ئەوەتا هەر لە سەرەتاوە خۆیان بۆ ئەم جۆرە گۆڕانانە ئامادە دەکەن، یا ئەوەی کە گۆڕان ڕووی دا، هەر زوو کۆمەڵێ بنەما و قانوون لەو هەلومەرجە تازەیە

هەڵدەهێنجێنن و کاری پێ دەکەن و دەیکەنە بناخەیەک بۆ ڕێکخستن و ڕێکخستنەوەی کۆمەڵ. دیارە بۆ هەڵهێنجانی ئەو بنەما و قانوونانە، کەس چاوەڕوانی ئەوە ناکات لە غەیبەوە (لە نەپەنی و نادیارەوە) هەواڵێک و ڕێنوێنییەک بگات. ئەوەی ئەم کارە دەکات مرۆڤەکانی کۆمەڵگەکە خۆیانن. لەم ئەرکەیشدا بێگومان سوود لە ئەزموونی وڵاتان و نەتەوەکانی دیکە وەردەگرن، بەڵام بە شێوەیەکی زیندوو، بێ کۆپیکردن، دەیخەنە خزمەتی ئەزموون و کارەکەی خۆیانەوە.
ئەوانەی دەبێ ئەرکی دۆزینەوەی قانوونەکان و ئەرکی ناسینەوە و گشتاندنی بنەماکان و خستنەگەڕیان جێبەجێ بکەن، ڕاست وایە کەسانێ بن شارەزای بوارەکانی کارەکەیان بن و هیچ گومانێک لە زانیاری و زانستیان نەکرێت، و لە دڵسۆزییان دڵنیا بین. ئەگەر ئەمە نەکرێت، ئاژاوە سەرتاپێی کۆمەڵ داگیر دەکات و ئەنجامەکان بە هیچ جۆرێک بەو شێوەیە نابن کە ببنە هۆی پێشخستن و گەشەکردن و چارەسەری گرفتەکان.
لە کوردستان، سیاسەتمەداران و سەرکردەکان پێشتر خۆیان بۆ ئەم بارە نوێیە ئامادە نەکردبوو. ئەمەیان ڕەنگە پاساو بدرێت، ئەگەرچی هیی پاساودان نییە. بەڵام تەنانەت دوای چواردە ساڵ حوکمڕانی، هیچ نیشانەیەک، هیچ هێمایەک، هیچ گەڵاڵەی بیرکردنەوەیەک نابینین پێمان بڵێ ئەمانە بەڕاستی دەیانەوێ کێشەکان چارەسەر بکەن. من باسی هەموو بوارەکانی کۆمەڵگەی کوردستان ناکەم، تەنیا و تەنیا باسی فەرهەنگ و زمان دەکەم.
ئەم ڕەوشە تازەیەی کوردستان وا پێویست دەکات زمان و فەرهەنگی کوردی بە جۆرێک نەخشەی بۆ بکێشرێت کە بتوانێت وەرامدەرەوەی پێویستی و ئامانج و داخوازەکانی نەتەوەی کورد بێت و یارای ئەوە بێت لە هەموو بوارەکانی زانست و زانیاری و گەشەکردندا وەک دەستاوێژێکی مرۆڤانە کار بکات و هەڵسووڕێت. هەروەهایش ئەوە دەستەبەر بکات کە کۆمەڵگەی کوردەواری دەکاتە ئەندامێکی کارا و چالاکی دنیای ئەم سەردەمە و مرۆڤی کورد بتوانێت لە شارستانێتیی ئەم چەرخەدا

بەشدارییەک، با کەمیش بێت، بکات. دەبێ فەرهەنگی کورد وەرامدەرەوەی پێویستییەکانی مرۆڤی کورد بێت، چ ماددی و چ ڕۆحی.
لە سەردەمەکانی پێشوودا زمان و فەرهەنگی کوردی سنوورێکی یەکجار تەسکیان بۆ دانرابوو. دەستگای ڕاگەیاندنی کوردی کەم بوون و ڕێژیمە داگیرکەرەکان دەیانبرد بە ڕێوە و بەشێک بوون لە سیاسەتی فەرهەنگیی ئەوان. مرۆڤی خوێندەواری کورد هەر بە هەستی خۆڕسکی خۆی، ئەو هەڵوێستەی لا دروست بووبوو کە بە هەموو هێزێکەوە دەست لە فەرهەنگ و زمانی خۆی گیر بکات و باوەشی بۆ بکاتەوە. کە گۆڤارێکی وەک (کاروان) یا (ڕۆشنبیری نوێ)ی دەخوێندەوە یەکسەر لە زەینی خۆیدا کردارێکی ماتماتیکییانەی ئەنجام دەدا، کە پێنج یا دە لاپەڕەی یەکەمی بە نوێنەری بیر و کرداری دەستەڵات دادەنا و ئەوانی دیکەیشی بەپێی ناوەڕۆک و بەپێی چێژی خۆی هەڵدەسەنگاند. لەبەر ئەوەی بڵاوکراوە و دەستگای ڕاگەیاندن کەم بوون، زیانیشیان هێندە بەربڵاو نەبوو، ئەگەرچی ئەو بەشەی لێ دەر بکە کە ئاوێنەی بیری داگیرکەران بوو، ئەوی دی شتی باشی تێدا بوو. بەڵام لەپاڵ زۆر شتی لاوازیشدا دەستگایەکی وەک کۆڕی زانیاری(ی) کورد لە بەغدا هەبوو کە، هەر نەبێ لە سالانی سەرەتای دامەزرانیدا، بەڕاستی جێی شانازی بوو بۆ کورد. پیاوانی وەک عەلائوددین سەججادی، مەسعوود محەمەد، کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەژار، هێمن، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، شێخ محەمەدی خاڵ، شوکور مستەفا، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، جەمال نەبەز، قەناتی کوردۆ، عەلی سەیدۆ گۆرانی و زۆری دیکە کاریان تێدا دەکرد، یا پشتیوانی بوون. بێجگە لە کۆمەڵێ دەستگای گرنگی دیکەی فەرهەنگی کە لە چوار ساڵی ئاشتیی ١٩٧٠-١٩٧٤ دا هەبوون.
ئەمڕۆ دەیان و سەدان ڕۆژنامە و گۆڤار بڵاو دەبنەوە و کتێب چاپ دەکرێن. دەیان دەستگای ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن و ئینتەرنێت هەن. زانیاریی خوێندەواری ناونجیی کورد لە ڕووی زمانەوە پاشەکشەی کردووە. جاران بەشی هەرە زۆری خوێنەری کورد بێجگە لە کوردی زمانێکی دیکەی دەزانی، کە لە عیراقدا عەرەبی بوو، کەچی ئەمڕۆ زۆربەی زۆری خوێنەری کورد لە کوردی بەولاوە زمانێکی دیکە

نازانێت. ئەوجا ئەو فەرهەنگ و زمان و زانیارییەی پێشکەشی ئەم خوێنەرە دەکرێت، بەرهەمێکی لاواز و سەقەت و نەخۆشە، بە زمانێک نووسراوە کە، بە قەولی مامۆستا گۆران، دەڵێی حەڵوای ئاردی جۆیە.
ئەو دەستگا فەرهەنگی و بەناو زانستییانەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا کاریگەرن و چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرێت فەرهەنگ و زمانی کوردی بەرەو چاکبوونەوە و دواتریش پێشکەوتن و گەشەکردن ببەن، بەشی هەرە زۆریان خۆیان نەخۆش و سەقەت و ڕووخاون، خۆیان بێناوەڕۆک و بێبەرنامەن.
لایەنە تێکشکاوەکانی زمان و فەرهەنگی کوردی لە کوردستانی خوارووودا زۆرن، هەرە گرنگەکانیان؛ تێکچوونی ڕێنووس، ڕێزمان، سینتاکسی ڕستەی کوردی و داڕمانی ئێستێتیکی شێوازی کوردینووسین. بیجگە لەمانەیش دەکرێ باسی هەژاری یا هەژارکردنی زمانەکەیش بکەین. ئەمانە هەموو فاکتۆری ترسناکن، بەڵام ترکزەی یەکەم، پێم وایە، نەبوونی سیاسەتێکی فەرهەنگی و نەبوونی سیاسەتێکی زمانەوانییە، کە بتوانێت بە وردی و ژیرانە کار بۆ دوارۆژی زمان و فەرهەنگی کورد بکات. ناتەواوی و لاوازی هەن و هەر دەشبن، بەڵام ماڵوێرانی ئەوەیە کە ئێمە نەخشەیەکمان نەبێت بۆ بنبڕکردنی ئەو ڤایرۆسانەی بەر بوونەتە گیانی زمانی کوردی.

**دیمانە: لە هەمان وتاردا دەڵێی «لە کوردستاندا یەک دانە ڕۆژنامە و حەوتەنامە و مانگنامە نییە کوردی بە شێوەیەکی ڕاست بنووسێت». ئەم دەربڕینەت تەنیا بۆ ئەو بەشەیە کە بە ئەلفبێی عەرەبی دەنووسێ یان بەشە لاتینییەکەیشە؟ هەر لەم بارەیەوە ئەو پرسیارەیشم هەیە ئاخۆ ئەو کەسانەی وەک ڕەخنەگر یان لێکۆڵەر لە زمان و فەرهەنگدا کتێب و بلاڤۆکیان هەیە، چی؟ ئایا ڕەخنەگرێکی زمان کە ڕەخنە لە بەهەڵەنووسین دەگرێ، ناکرێ خۆی بەو ئاستە گەیشتبێت بە دروستی و بێ هەڵە بنووسێت؟ یان وەک تۆ دەڵێی کە هیچ کەس بە دروستی نانووسێ، دەبێ هەر لە بنەڕەتدا ڕێنووسی کوردی بەهەڵە داڕێژرابێت؟**

شاکەلی: سەرنج و تێبینییەکانی من لە پلەی یەکەمدا زمانی ستانداردی کوردی دەگرێتەوە کە ئەمڕۆ لە دوو بەشی کوردستاندا وەک زمانێکی ئەدەبی بە کار دەهێنرێت و لە ڕووی بەرهەمی نووسراو و چاپکراویشەوە نزیکەی ٧٥% تا ٨٠%ی زمانی کوردی دەگرێتەوە. با من ئەوەیش ڕوون بکەمەوە کە نازانم بۆ بەو ئەلفوبێیە دەڵێن ئەلفوبێی عەرەبی؟ باوەڕ ناکەم زمانزانێکی فارس یا پاکستانی بە ئەلفوبێی زمانەکەی خۆی بڵێ عەرەبی. تەنانەت ئەوروپاییەکان کاتێ باسی ئەو جۆرە ئەلفوبێیە دەکەن تێرمی (Modified, modefierad) بە کار دەبەن.

ئەو بەشەی زمانی کوردی کە بە تیپی لاتینی دەنووسرێت، لە ڕووی بنەماکانی ڕێنووسەوە ڕەنگە کێشەی کەمتر بێت، بەڵام کێشەی گەورەتری هەیە کە دوویان یەکجار زەق و لەبەرچاون: ئەلفوبێیەکە خۆی ئەلفوبێیەکی سەقەت و نازانستی و ناکوردییە، چونکە نەک بە کەڵکی هەموو زمانی کوردی، بگرە بە کەڵکی زاراوای کرمانجی خۆیشی نایەت. کۆمەڵێ فۆنێمی گرنگی زمانی کوردی هەن کە دەبوو لە ئەلفوبێیەکەدا ئیشارەتێک، نیشانەیەک بۆ پیشاندانیان هەبووایە، بەڵام نییە و دانەنراوە. دووەمیش کرمانجی شێوەیەکی ستانداردی نییە و نەیتوانیوە وەک زمانێکی ئەدەبی گەشە بکات و شێوەیەکی ستاندارد دروست بکات. لەوەیش بترازێ ئەو هەموو هەڵایەی لەسەر جیاوازیی ئەلفوبێی کوردی دەکرێت، لە ڕاستیدا ئەوە تەنیا کێشەی کرمانجییە، کە بە سێ ڕێنووسی جیاواز دەنووسرێت، دەنا کوردیی خواروو (کە من پێم وایە زمانی ستانداردێ کوردییە) هەر بە یەک ئەلفوبێ دەنووسرێت.

قەیرانێکی سەخت و بێزاریهێنی (دەبوو بڵێم ئێڵنجهێن!) ئەم باسە ئەوەیە کە بەشی هەرەزۆری، یا ڕەنگە هەر هەموو، ئەوانەی باسی زمان دەکەن و خۆیان دەخەنە ناو کێشەکەوە کەسانێکن هیچ پێوەندییەکیان بە زمانەوە نییە و تێی ناگەن و هیچی لێ نازانن. لەبەر ئەوەیش دەبینی هەرچییەک دەڵێن و دەنووسن هەر هەمووی لە نوختەی سیاسەتەوە یا لە پێگەی نەخوێندەواری و نەزانینەوە دەردەچن. کەسێکیان تاکە جارێ

بەڵگەیەکی زانستی و زمانەوانیی پێ نەبووە و نییە. هەروەها لە دنیای جەنجاڵی نووسینی کوردیدا جیاوازیی نێوان کوردیزان و زمانزان یا زمانەوان ناکرێت. هەر کەسێک کوردییەکی جوانی نووسی مانای ئەوە نییە کە دەتوانێ زمانەوانیش بێت. زمانەوانی وایش هەیە کە ناتوانێت نامەیەک بە کوردییەکی جوان بنووسێت. من گەلێ جار ئەمەم گوتووە، کە پیاوانێکی وەک هێمن و هەژار و سەججادی و تەنانەت شوکور مستەفایش کوردیزان بوون، کوردیزانی گەورەیش بوون، بەڵام زمانەوان نەبوون. ڕەنگە ئەگەر لای مام هەژار باسی فۆنیم یا دیفتۆنگت بکردایە، پێی وا بووایە ئەمانە ناوی دەرمانن.

ئەو کەسانەی لەبارەی زمانی کوردییەوە دەنووسن، بێگومان، دەبێ زمانەوانیش بن، یا هەر نەبێ شتێکی وەهای لێ بزانن کە بۆ پاڵپشتی باوەڕ و بۆچوونەکانیان بەڵگەیەکی زانستییان بە دەستەوە بێت. بەشێکی یەکجار زۆری ئەوانەی لە بواری زمانی کوردیدا کار دەکەن و دەنووسن و بۆچوونێکیان هەیە، لە ڕووی ڕێنووسەوە کۆڵەوارن و ئەوەی دەینووسن هەڵەیە. من کە دەڵێم هەڵەیە، مەبەستم ئەوە نییە، لەبەر ئەوەی بە لای منەوە هەڵەیە، ئیتر بە هەڵەی دادەنێم، مەبەستم ئەوەیە لە ڕووی زانستییەوە ئەوەی دەینووسێت و دەیڵێت بەرگەی ڕەخنەیەکی جیددی ناگرێت.

لەم ڕۆژانەدا هەواڵێکم خوێندەوە باسی ئەوە دەکات کە بەشە کوردییەکانی زانستگەکانی کوردستان و بەشی کوردیی زانستگەی بەغدا کۆنفەرانسێکیان پێک هێناوە بۆ هاوکاری و نزیککردنەوەی بەرنامەکانی خوێندن و شتی لەو بابەتە. ئەوەی بە لای منەوە سەرنجڕاکێش بوو، قسە و نووسینی سەرۆکبەشەکان بوو کە ڕۆژنامەکە دواندبوونی. ڕەنگە ئەو هەموو هەڵەیەی لە نووسینەکەدا هەبوو، تاوانی ڕۆژنامەنووسەکە بووبێت (حەز دەکەم ئەوەت عەرز بکەم کە هەڵەی نووسین، لای من، تاوانە)، بەڵام تەنانەت بیروباوەڕەکانیشم پێ سەیر بوون. ئاشکرا دیار بوو کە هەندێ لەو دۆستانە هەر هیچ ئاگایان لە هەلومەرجی زمان و فەرهەنگی کورد نییە و نازانن چی ڕوو دەدات. تەنانەت تێرم و زاراوەکانیان بە هەڵە بە کار هێنابوو. باشە دەبێ ئەو چەندسەد خوێندکارەی لەم بەشانەدا

پەروەردە دەکرێن، چ کوردییەک فێر بن و کامە زانستیان پێشکەش بکرێت؟
ناکرێ بڵێین ڕێنووسی کوردی هەر لە بنەڕەتدا هەڵەیە. ڕێنووس، وەک زۆر بابەتی دیکەی دنیای زانست و خوێندەواری، مەسەلەیەکی پێکهاتنە (Conventional)، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوەی دەینووسین و دەیڵێین لەگەڵ بنەماکانی ڕێنووس و ڕێزماندا، لەگەڵ بنەما مەنتیقییەکاندا، هاوئاهەنگ و گونجاو بێت. کابرایەک، کە خۆی بە نووسەر دەزانێت، بە دەست ڕێنووسەوە داماوە و لە تێکستێکی نیولاپەڕەییدا حەڤدە هەڵەی هەیە، ئەمە تاوانی زمان و ڕێنووسی کوردی نییە، تاوانی خۆیەتی کە ناتوانێ بنەما و قانوونە ڕاستەکان فێر ببێت .کەسێک ساڵەهای ساڵ خەریکی کوردینووسین بێت، هێشتا ئەوەندە حاڵی نەبووبێت کە ڕاست و ناڕاست لە یەک بکاتەوە، نازانم بۆ دەنووسێت؟ من بەوەیش ڕازیم کە کابرا شێوەیەکی هەڵە بە کار ببات بەو مەرجەی لە سەرتاسەری نووسینەکەیدا خۆی پێوە ببەستێت، نووسەرێک کە با بڵێین باسی شێخ مەحموود دەکات، هەر لەو نووسینەدا ناوی شێخ بە چوار پێنج شێوەی جیاواز دەنووسێت :مەحموود، مەحمود، محمود، محموود، من ئیتر ناتوانم هیچ ڕێزێکی نووسینەکەی بگرم.
ئێستا دیاردەیەکی زۆر سەیر لە دنیای فەرهەنگ و زمان و خوێندەواریی کوردیدا پەیدا بووە. دەیان کەس هەن هەر لە خۆیانەوە باسی زمان و ڕێنووس دەکەن بێ ئەوەی هیچی لێ بزانن، بێ ئەوەی زمانزان یا کوردیزان بن، بێ ئەوەی تەنانەت سەرەتا ئاسانەکانی زمان و فەرهەنگ بزانن. لە کوردستانی خواروو هەر میوانێکی نەخوێندەواری کوردی تورکیا و ڕووسیا دەچێتە ئەوێ، یا هەر کۆلکە خوێندەوارێکی ئەوروپایی (تەنانەت جاسووسەکانیش) سەر دەدات، بەپەرۆشەوە دەچنە خزمەتی و بە جۆرێ پرسیاری زمان و ڕێنووسی لێ دەکەن وەک بڵێی یارۆ سەرۆکی باڵای زمانی کوردی بێت. خوێنەری نائاگای کوردیش کە ئەم ناوانە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و پەردەی تەلەڤیزیۆن دەبینێ، پێی وایە ئەمانە بەڕاستی شتێک دەزانن و بێ و نەبێ دەرمانی هەموو دەردێکیان لە لایە.

له بواری کوردینووسیندا ڕۆژنامەوانەکانی کوردستان یەکجار کۆڵەوار و نەخوێندەوارن. بەرهەمەکەیشیان ئەو ئاژاوە بەدبەختانەیەیە کە یەخەی فەرهەنگ و زمان و نەتەوەی کوردی گرتووە. تاکە ڕیزپەڕ گۆڤاری (ڕامان)ـە کە هەوڵ دەدەن ڕێنووسێکی یەکگرتوو بە کار بهێنن. ناڵێم لەو هەوڵەدا سەرکەوتوون، من خۆیشم زۆر کێشەم لەگەڵیان هەیە و پێم وایە لە هەندێ ڕووەوە هەڵەن، بەڵام ڕێزی هەوڵەکانیان دەگرم چونکە بە جیددی بیر لە ڕێنووس دەکەنەوە. دەستگایەکی وەک کۆڕی زانیاریی کوردستان، تەنانەت ناوی دەستگاکەیشیان بە هەڵە دەنووسن. نازانم چەند ئەندامیان هەیە، بەڵام بە دڵنیایی پێت دەڵێم کە تاکە یەک زمانزانیان تێدا نییە، تەنانەت نیوە زمانزانێکیشیان تێدا نییە. جاران بە ناهەق بەو کۆڕەی کە ساڵانی حەفتاکان هەبوو دەیانگوت (گۆڕی) زانیاری، بەڵام بەڕاستی ئەوەی ئەمڕۆ هەیە (گۆڕی زانیاریی کوردستان)ـە، دەستگایەکی مردوو، ترسنۆک، هەلپەرست و بۆگەن.
بەڵێ، من جارێکی دیکەیش هەر ئەو باوەڕەم دووبارە دەکەمەوە: لە کوردستاندا یەک دانە ڕۆژنامە و حەوتەنامە و مانگنامە نییە کوردی بە شێوەیەکی ڕاست بنووسێت. یەک دانە کتێبیش نییە سەرتاسەر ڕاست نووسرابێت.

**دیمانە: لە وتارەکەتدا کە ڕوو دەکەیتە «هەموو نووسەرانی کوردستان» باس لە گرفتی ڕێزمان و ڕێنووس دەکەی و ئاماژە بەوە دەکەی کە «چارەسەری ئەم دوو پەتایە، ڕەنگە لە ئەرکە هەرە ئاسانەکانی زمان و فەرهەنگی کورد بێت». لە درێژەی وتارەکەدا «دەگەیتە لێواری بێهومێدی». ئەم بێهومێدییەی تۆ لە چی و لە کێیە؟ ئایا دەسەڵاتدارانی نیشتمانە بێهومێدت دەکەن یان بێدەسەڵاتیی نووسەران؟ ئەگەر ئەم کارە هێندە ئاسانە، چۆنە نە دەسەڵاتدار و نە نووسەر و نە هیچ کەس و ناوەندێک کاری بۆ ناکات؟ بە باوەڕی تۆ ئێمە هەتاکەی بەم ڕێگە نادروستەدا دەڕۆین؟**

شاکەلی: من نازانم هەتا کەی بەم ڕێگە ناپیرۆز و نادروستەدا

دەڕۆین، بەڵام دەزانم ئەنجامی ئەم بارەی ئەمڕۆ پووچانەوە و هەڵوەشانەوەی هەموو گەنجینە و شانازییەکانی مێژووی فەرهەنگ و ئەدەب و زمانی کوردییە. دەزانم ئەنجامەکەی تەنانەت هەڵوەشانەوەی کورد خۆیشییە وەک نەتەوەیەک.
ئەمڕۆ لە کوردستانی خوارووودا هەلێکی زێڕینی وا هاتۆتە پێشەوە کە کورد ببێتە خاوەنی فەرهەنگێکی دەوڵەمەند، زمانێکی ئەدەبیی ستاندارد و نەوەیەکی خوێنەوار و ڕووناکبیر، بەڵام کار و کردەوەی سەرکردایەتیی سیاسیی کورد ڕێک بە پێچەوانەوە دەڕوات و ڕێگەیەکی گرتۆتە بەر کە بەرەو هەڵدێر و ملشکان و نابووتبوونمان دەبات. خانیی گەورە کە گلەیی لە سەردەمی خۆی و لە ژێردەستیی کورد دەکات، تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی دەستەڵاتداران و سەرکردەکان، نەک هەژار و خوێنەوارەکان، یا بە زمانی ئەمڕۆ: ڕووناکبیران و چەوساوەکان:
نامووسە ل حاکم و ئەمیران
تاوان چییە شاعیر و فەقیران؟
ئەمڕۆ بەشی هەرەزۆری سەرکردە و سیاسەتمەداری کورد بەڕاستی نەخوێندەوارن. نەک هەر ئەوەیش بگرە دژی خەڵکی خوێندەوارن و تا بۆیان بکرێت دەیانەوێ دووریان بخەنەوە. ئەوان تەنیا ئەو خوێندەوار و ڕووناکبیرانەیان دەوێ کە ملکەچی خۆیان و حیزبەکانیانن، ئەوانەیان دەوێ کە ئامادەن خۆیان بفرۆشن و زمانیان گرێ بدەن و هەرگیز وشەی (نا) بە کار نەبەن. ئەمانە ئەو (حەکیم)ەن کە مام هەژار جارێ چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە، گوتی بە سوڵتانی گوتووە: قوربان من غوڵامی حەزرەتی سوڵتانم نەک حەزرەتی باینجان. ئەمانە (وعاظ السلاطین)ی فەرهەنگی کۆمەڵناسییەکەی دۆکتۆر (عەلی وەردی)ی ڕەحمەتین.
چارەسەر، دیسانیش دەیڵێمەوە، ئاسانە و نەکراو نییە: کۆمەڵێ دەستگای زانستی کە کەسانی شایان و لێهاتوو بیبەن بە ڕێوە و کاری تێدا بکەن، پلانێکی تۆکمەی فەرهەنگی بۆ بەدیهێنانی ڕینیسانسێک لە زمان و فەرهەنگی کوردیدا (واتە سیاسەتێکی فەرهەنگی: Cultural

(policy) سەرکردەیەکی (یا سەرکردایەتییەکی) بەجەرگ و بوێر کە لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە پشتیوانیی پرۆژە فەرهەنگییەکە بکات.
هۆیەکی زۆر بنەڕەتانەی قەیرانەکانی زمانی کوردی لەوەوە سەری هەڵداوە کە لە وڵاتی ئێمەدا خەڵک بەگشتی و لە پێش هەموویشیانەوە نووسەران و ڕووناکبیران، لە ڕووی زانستییەوە شارەزای زمانی کوردی نین، ئاشنای پێکهاتەکەی نین، ڕێزمانیان بە شێوازێکی زانستی نەخوێندووە و فێری نەبوونە. بێ زانینی ڕێزمانیش زۆر زەحمەتە تۆ لە بنەماکانی ڕێنووس بگەیت. لای ئەو نەتەوانەی کە مێژوویەکی دوورودرێژی نووسین و خوێندەوارییان هەیە و بە شێوەیەکی زانستی زمانەکەیان داڕشتووە و خوێندەوارانیان پەروەردەکردووە، ئەم کێشەیە بڕاوەتەوە. ڕێنووس تا ڕادەیەکی زۆر پێوەستی ڕێزمانە. دەمەوێ بڵێم ئەمە ڕێزمانە کە بە ڕادەی یەکەم بڕیار دەدات وشە دەبێ وەها بنووسرێت و وەها نەنووسرێت. من ناڵێم هەموو کەسێک کە خوێندی ئیتر دەبێ وەک زمانەوانێک شارەزای زمان بێت، بەڵام خۆ دەبێ لە خوێندنگەدا ئەوەندەی فێر بکەن کە بەشەکانی ڕستەیەک بناسێتەوە و بزانێت وشە چۆن دەنووسرێت. تۆ کە ڕێزمانت نەزانی، دیارە ناشزانی بۆچی، بۆ نموونە، هەندێ (دا) دەبێ بە وشەکەی پێش خۆیەوە بنووسرێت و هەندێکیشیان بە جیا. لەوە ناگەیت بۆچی بۆ یەکەم کەسی کۆی نەفیکراو دەبێ بنووسیت (نیین)، بەڵام بۆ دووەم و سێیەم کەس (نین). هەتا ئێستایش من تاکەکەسێکم نەدیوە لەو وردەکارییانەی زمان تێگەیشتبێت و کاری پێ کردبێت.

**دیمانە: کاک فەرهاد، بۆئەوەی خوێنەر باشتر لە مەبەستی تۆ تێبگات، تکایە ئاماژە بە هەندێک لە هەڵە زەق و بەرچاوەکان بکە کە لە میدیا و بڵاقۆکی کوردیدا دێنە بەرچاو.**

شاکەلی: هەڵەکان یەکجار زۆرن. من هەموو جارێ کە ڕۆژنامەکانی کوردستان لەسەر ئینتەرنێت تەماشا دەکەم، دەیان و سەدان هەڵەی ناقۆڵام بەرچاو دەکەوێ، کە پیاو پێیان دەهری دەبێت. بەڵام دەبێ

ئەوەیش ڕوون بکەمەوە کە قەیرانی زمانی کوردی تەنیا مەسەلە هەڵەی ڕێنووس و ڕێزمان نییە.
وەک نموونەی هەڵەی باو دەتوانم ئەمانەت بۆ باس بکەم:
- نەزانینێکی تەواو لەبارەی بەکارهێنانی پۆستپۆزیسیۆنەکانی (دا، وە، ڕا...هتد)وە. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کابرای نووسەر لەبارەی دۆخەکانی ناوەوە لە زمانی کوردیدا (دۆخ: Case, Kasus) هیچ نازانێ.
- تینەگەیشتن لە بنەماکانی دروستکردنی ناوی لێکدراو، بەگشتییش بابەتی وشەسازی (Word formation). لەبەر ئەوەیش ئەم جۆرە هەڵانە هەمیشە دووبارە و سەدبارە دەبنەوە.
- هەڵەکردن لە بەکارهێنانی ناو لە دۆخی ئیزافەدا(Genitive)، بەتایبەت کە ناوەکەبە (ی) تەواو دەبێت.
- بەکارهێنانی هەڵەی ڕاناوی لکاو (بەتایبەت کەسی سێیەمی تاک و کۆ) کە بە ناوێکەوە دەنووسرێن بە (ی) تەواو بووبێت.
- ناشارەزایی لە بنەماکانی بەکارهێنانی خاڵبەندی (Punctuation).
- ونبوون و لەناوچوونی بەشێک لە پۆستپۆزیسیۆنەکان، بەڵام بەپێچەوانەوە دانانی پۆستپۆزیسیۆن لەو جێگایەدا کە پێویست نییە.
- بەکارهێنانی هەڵەی پێشگر(Prefix)ی هەندێ کردار وەک (هەڵ)، لە کاتی گەردانکردنی کردارەکەدا.
- تێکەڵکردنی شێوەی (و) و (وو) لەو فۆرمە ڕێزمانییەدا کە پێی دەگوترێت (Past particip).
- ناشارەزایی لە فەرهەنگ و شیعری کلاسیکی کوردی. لەم ڕۆژانەدا ڕۆژنامەیەکی گەورەی کوردستان بە خەتێکی درشت دێڕێکی (ئەی ڕەقیب)ی ئاوەها نووسیبوو: (زیندووە قەد نانەوێ...!) هەروەها هەر ئەو ڕۆژنامەیە شیعرە ناودارەکەی پیرەمێردی وا لێکردبوو: (دایکی وەتەن دە هەستە سلاویان لێ بسێنەوە...!).
- هەڵەکردن لە گەردانکردنی ئەو کردارانەدا کە ڕەگی ڕابوردوویان بە (ی) تەواو دەبێت، کاتێ دەنووسێنرێن بە ڕاناوی لکاوەوە.
- بەکارهێنانی شێوەیەک سینتاکس (Syntax) کە ڕاستەوخۆ لە زمانێکی بێگانەوە وەرگیراوە و کوردی نییە.

ئەمانە تەنیا نموونەی ئاسایین کە ڕۆژانە بەرچاو دەکەون. ئەوجا پێم بڵێ چەند کەس لەوانەی سەدان لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستان ڕەش دەکەنەوە، ئەم بنەمایانە دەزانن و بە جێی دەهێنن؟ لەوەیش بترازێ بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین و نەزانانە وشە لە دیالێکتی کرمانجیی سەرووەوە وەردەگرن بێ ئەوەی هیچی لێ بزانن، بێ ئەوەی شارەزای بنجوبناوانی وشەکە بن. پێیان وایە بەم بەکارهێنانە ئیتر زاراواکانی زمانی کوردی لە یەکدی نزیک دەبنەوە و زمانی یەکگرتوو دروست دەبێت.

**دیمانە: لە وتارەکەتدا ئەلفبێی کورمانجیی سەروو بە هی "کەمالیستانەی ئەتاتورکانەی لاتینی" دەناسێنی. تکایە لەم بارەیەوە زێدەتر بۆمان بدوێ. لەگەڵ کورمانجیی خوارووداچۆنی هەڵدەسەنگێنی؟**

شاکەلی: ئەلفوبێی لاتینی لای کورد دیاردەیەکی سیاسییە و ڕاستەوخۆیش بەستراوە بە هەوڵدانی ئیمپەریالیستانەوە بۆ دابەشکردنی کوردستان. ئەوانەی کوردستانیان لە ڕووی جیۆگرافی و سیاسییەوە پارچەپارچە کرد، هەر ئەوانیش بوون کەوتنە ئامادەکاری بۆ پارچەپارچەکردنی زمانەکەی و فەرهەنگەکەی. دیارە لەم بوارەدا ڕۆژهەڵاتناسانی ئەورووپایی ڕۆڵێکی یەکجار ناپیرۆزیان هەبوو، چونکە دەیان درۆیان بڵاو دەکردەوە و بە ناوی زانستەوە بە خەڵکیان دەفرۆشت. ئێستایش لەسەر ئەو پیلانگێڕانەیان هەر بەردەوامن. بێگومان هەندێ لە کارەکانیان بە هۆی هەندێ ڕووناکبیری ناپاکی کوردەوە جێبەجێ دەکەن.

گەورەترین نموونەی ڕۆژاواپەرستی و شێواندنی ناسنامەی ڕۆژهەڵاتی مستەفا کەماله (ئەتاتورک)، کە ویستی بەزۆر نەتەوەی تورک بکاتە نەتەوەیەکی ڕۆژاوایی و هەموو شارستانێتی و ڕابوردووی بسڕێتەوە. هەڵوێست و ئیدیۆلۆگیی ئەتاتورک بە ئاشکرا ڕەگەزپەرستانە بوو. ئەو دژی عەرەب بوو، دژی ئیسلام بوو، دژی ڕۆژهەڵات بوو. دەیویست بە هەر نرخێک بووە لەوانە دوور

بکەوێتەوە. وای دەزانی هەر بەوەی خۆی لەو فەرهەنگە دوور بخاتەوە ئیتر دەبێتە ئەوروپایی و مۆدێرن و پێشکەوتوو. ئەنجامەکەیشی ئەمەی لێ دەرچوو کە ئەمڕۆ بەسەر تورکدا هاتووە و دێت: گەلێکی بێناسنامە، نە بە ڕۆژهەڵاتی مایەوە و نە بوو بە ڕۆژاوایی(و نە دەشبێت).

لەناو کورددا کەس هێندەی بنەماڵەی بەدرخان دڵسۆزی بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆگیی ئەتاتورک نەبوو. ئەوان ئەگەرچی بە ڕووالەت دژی تورکیا بوون، بەڵام لە ڕاستیدا ناکۆکییان تەنیا لەسەر دەستەڵات بوو. جەلادەت و کامڕان بەدرخان لە هەموو ژیانیاندا هەوڵی ئەوەیان دەدا لاسایی ئەتاتورک بکەنەوە و زۆریش لە دڵەوە سەرسامی کەسایەتی و بیرکردنەوەی ئەتاتورک بوون. بەردخانییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا دەستەڵاتی سیاسییان لە کوردستاندا نەما و ئەمارەتەکەیان ڕووخا. جەلادەت و کامڕان دەیانویست ئەوەی کە لە سیاسەتدا دۆڕاندوویانە لە زمان و فەرهەنگدا وە دەستی بێننەوە. بنەماڵەی بەدرخان هەر دوای ڕووخانی میرنشینی بۆتان لە ئەستەمبووڵ و لە کریتا و لە چەند جێیەکی دیکە ژیان بەڵام هەمیشە ئاشنایەتی و پێوەندییان لەگەڵ دەستگاکانی ئیمپەریالیستیدا هەبووە. پەیدابوونی بیری گۆڕینی ئەلفوبێیش بەرهەمێکی ئەم بیرکردنەوەیە و ئەم پێوەندییە بوو. ئەمەیش هیچ سەیر نییە کاتێ کە دەزانین سەرچاوەی ئیدیۆلۆگیی ئەتاتورک و بەدرخانییەکان هەر یەک سەرچاوەیە و هەردوو لایان لە یەک کانیی ژەهراوییان خواردووەتەوە.

ئەگەر ئەو بابەتەیش بخەینە لاوە، بەڵام ئەلفوبێی لاتینی لە ڕووی زانستییەوە ئەلفوبێیەکی ناتەواو و هەڵەیە و دەڕۆستی دەنگەکانی (فۆنێمەکانی) زمانی کوردی نایەت. هێندەی من بزانم بە لای کەمەوە حەوت فۆنێم لە کوردیدا هەن کە لەو ئەلفوبێیەدا هیچ نیشانەیەکیان بۆ دانەنراوە.

بۆ من پرسیارەکە ئەوە نییە کە ئایا دەکرێ ئەلفوبێیەکە بگونجێنرێت و چاکسازی بکرێت یا نە، مەسەلەکە ئەوەیە کە بۆچی، لە پێناوی چیدا و

بە چ مەبەستێک دەبێ ئەلفوبێ بگۆڕین؟ ئەلفوبێی ئەمڕۆی کوردی ئەلفوبێیەکی ڕێکوپێکە و بە جوانترین شێوە لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا گونجێنراوە. ڕەنگە یەک دوو وردە کێشەی تیدا مابێتەوە، بەڵام ئەوانە بەئاسانی چارەسەر دەکرێن. ئێمە ئەگەر لەماڵەکەماندا پەنجەرەیەکمان درزی بردبوو، نایەین هەموو خانووەکە بڕووخێنین بە نیازی چاککردنی پەنجەرەکە. پەنجەرەکە خۆی چاک دەکەین و تەواو. ئەوجا ئەگەر ئەو خانووە شوێنەوارێکی مێژوویی بوو، هەزار ساڵ تەمەنی بوو، وەک زمانی کوردی، ئەوە هەر تاوانێکی نەبەخشراوە بەرانبەر بە کورد و بە شارستانێتی و بەرانبەر بە هەموو مرۆڤایەتی، ئەگەر تێکی بدەین و بیڕووخێنین.

زۆر جار مەسەلەی کەمایەتی و زۆرایەتی وەک بەڵگە دەهێنرێتەوە. ئەمە هیچ ڕاست نییە، بەڵکە بیرکردنەوەیەکی سیاسییە، نەک زانستی. ئێمە کە باسی زمان دەکەین، باسی تێکست دەکەین، باسی زمانی نووسراو دەکەین، باسی زمانی قسەکردن ناکەین. بە گۆڕینی ئەلفوبێ هەموو گەنجینەی نووسراومان لە ناو دەچێت و بە دەستی خاڵی دەمێنینەوە. بەشی هەرەزۆری زمانی کوردی بە ئەلفوبێی کوردی نووسراوە. من لەم ڕووەوە ئامارێکی چەسپیوم بە دەستەوە نییە، بەڵام بە خەمڵاندنێکی مەنتیقی دەتوانم بڵێم ٨٥% تا ٩٠%ی زمانی کوردی بەم ئەلفوبێیە نووسراوە و دەنووسرێت. ئێمە ناکرێ بێین لەبەر خاتری کوردی کوردستانی سەروو هەموو زمان و فەرهەنگی کورد هەڵتەکێنین و واز لێ بێنین، لەبەر ئەوەی پێمان وا بێت لاتینی دەمانکاتە گەلێکی مۆدێرن و بەمە دەبینە ئەوروپایی. ئەو ١٥% یا ١٠%یەی دەمێنێتەوە ئەو ئەدەبەیە کە نووسەرانی ئەمڕۆی کوردستانەکانی تورکیا و سووریا و ڕووسیا دەینووسن و بەرهەمی دێنن، کە ئەویش لە ڕووی ئێستێتیکی و هونەرییەوە نرخێکی ئەوتۆی نییە. هیچ گەلێکی خاوەنشارستانی و خاوەنفەرهەنگ نییە لە دنیادا وازی لە ڕابوردووی خۆی هێنابێت لەپێناوی شتێکی پووچ و بێناوەڕۆکی وەک ئەلفوبێی لاتینیدا. ئەوە چین، ژاپۆن، ڕووس، جوولەکە، یۆنان، ئەرمەنی، گورجی، هیندستان، پاکستان، عەرەب،

فارس، ئەتیووپی و بەنگالی. کێ تا ئێستا خۆی تووشیماڵوێرانیی وەها کردووە؟ کەس! ئەگەر ئەمڕۆ هەندێ کۆلکە خوێندەواری کوردستانی تورکیا دەهۆڵ بۆ لاتینی لێ دەدەن لەبەر دڵسۆزیی زمان و فەرهەنگی کوردی نییە، بەڵکە لەبەر ئەوەیە ئەمانە کوردی کەمالیستن، شوێنپێی جەلادەت و کامران بەدرخان هەڵدەگرن کە شەیدا و دۆستی ڕۆژاوا بوون. ئەمانەی ئەمڕۆیش بۆ تێزە نامرۆڤانەکانی ڕۆژاوا لیک بە دەمی خۆیان و مێشکیان و قەڵەمیاندا دێتە خوارەوە. هۆیەکی دیکەیش ئەوەیە ئەمانە نە کوردی دەزانن، نە ئاگایان لە ڕابوردووی فەرهەنگ و زمانی کوردی هەیە.
هەلومەرجی کوردستانی باکوور زۆر لە هەلومەرجی جەزائیر دەچێت کە فرانسا داگیری کردبوو: داگیرکارێک کە هەوڵی داوە گەلی داگیرکراو زمان و فەرهەنگی خۆی لە بیر بچێتەوە و لەو کارەیشدا زۆر سەرکەوتوو بووە. بەڵام ڕووناکبیران و خەباتکارانی جەزائیر زۆر لەوانەی کوردستانی تورکیا ژیرتر و هۆشیارتر بوون، چونکە ئەوان مێشکیان نەشۆرابووەوە. ئەوان وازیان لە زمان و فەرهەنگ و دینی خۆیان نەهێنا، وازیان لە ئەلفوبێی خۆیان نەهێنا، بەپێچەوانەوە ئەمانەیشیان کردە کەرەستەی خەبات و تێکۆشان دژی فرانسا. کاتێکیش ڕزگار بوون، مامۆستای عەرەبیزانیان لە هەموو وڵاتانی عەرەبەوە برد بۆ جەزائیر و هەڵمەتێکی عەرەباندن (تعریب)یان دەست پێ کرد بۆ گەڕانەوە بۆ فەرهەنگ و زمانی خۆیان. ئەمڕۆ کە لە کوردستانی عیراقدا دەرفەتێکی باش پەیدا بووە و کوردی باکوور دەتوانن سوودی لێ وەربگرن بۆ ئەوەی فێری کوردی ببن، بۆ ئەوەی ببنەوە بە کورد، کەچی ئەوان دێن و دەیانەوێ ئەوەی لەوێ لە ماوەی سەدوپەنجا ساڵدا بنیات نراوە، ئەویش لەناو ببەن و بیڕووخێنن. بەرپرسە نەخوێندەوار و کوردینەزان و بێفەرهەنگەکانی کوردستانیش بێ بیرکردنەوە، بێ وردبوونەوە دەرگایان بۆ ئاوەڵا کردوون و کۆمەکیشیان دەکەن بۆ ئەوەی ئاگر بەر بدەنە ماڵی زمان و فەرهەنگ و مێژووی کورد.

پێم وایە کەم کەس هەیە لەناو خوێنەواری کورددا هێندەی من پێوەندیی لەگەڵ کوردستانی تورکیا و خوێنەوارانی ئەوێدا هەبێت. بە دڵنیایی پێت دەڵێم لە پانزدە بیست ملیۆن کوردی تورکیا، باوەڕ ناکەم بیست کەس هەبن دیوانی مەلای جەزیری و مەموزینی ئەحمەدی خانییان خوێندبێتەوە و لێی گەیشتبن. ئەگەر بیست کەس هەبن، ئەوا نۆزدەیان مەلان و ئەلفوبێی کوردی دەناسن. جا بۆ دەبێ بە دەستی خۆمان ئەوەی خوێنەوار و نووسەر و شاعیر و زانا و ڕووناکبیری کورد لە ماوەی هەزار ساڵدا دروستیان کردووە، بیڕووخێنین؟ بۆ دەبێ کارێکی وا بکەین دوای پەنجا ساڵ گەنجێکی کورد جەزیری و نالی و خانی و وەفایی و گۆران و هێمن و مەسعوود محەمەد و سەججادی نەناسێت؟

**دیمانە: چەند کورتەپرسیار:**

**ئایا فەرهاد شاکەلی بەبێ هەڵە کوردی دەنووسێ؟**

شاکەلی: لێتی ناشێرمەوە دەمویست هەروا سووک و ئاسان بڵێم (بەڵێ) و ئیتر بیبڕمەوە، بەڵام دەزانم ناکرێ، چونکە لە لایەکەوە وەرامەکەم ئەودەم ڕاستییەک دەشێرێتەوە کە ڕەنگە بە خۆدزینەوە بۆم حیساب بکرێت، لە لایەکی دیکەیشەوە ڕێز و خۆشەویستی و پەرۆشم بۆ خوێنەری کورد وام لێ دەکات لە نیوەی ڕێدا بە جێی نەهێڵم، بەڵکە پێبەپێ لەگەڵی بڕۆم تا دەگەینە لێکحاڵیبوونێکی باشتر.
ڕەنگە تۆ مەبەستت تەنیا هەڵەی ڕێنووس بێت، بەڵام باسەکە لای من لەوە فراوانترە: ڕێزمان، شێواز، سینتاکس، وشە و دەربڕین، ئێستێتیک، خاڵبەندی و لایەنی دیکەیش.
ئەگەر هەر بەگشتی باسی کوردینووسین بکەین، ئەوا لە دنیای ئەمڕۆی کوردەواریدا کۆمەڵێ خەڵکمان هەن کە کوردییەکی جوان و بێ گرێ و پاراو دەنووسن، دیارە لە پلەی جیاوازدا، بۆ نموونە: عەزیز گەردی، لەتیف هەڵمەت، عەبدوڵڵا پەشێو، شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵڵای حەسەنزادە، ئەمجەد شاکەلی، حەمەسەعید حەسەن، خەبات عارف، ئامانج شاکەلی، ئەنوەر قادر، عەتای نەهایی، کوردۆ عەلی... و چەند کەسێکی دی کە

بەداخەوە لەم ئان و ساتەدا بیرم بۆیان ناچێت. بەڵام هەر لەناو ئەم دۆستە بەرێزانەیشدا هیی وا هەن کە فریان بەسەر ڕێنووسەوە نییە و لێی نازانن. پەشێو، هێندەی من ئاگادار بم، چونکە زوو زوو یەک دەبینین یا بە تەلەفۆن قسان دەکەین، لە هەموویان زێتر ئاگاداری ئەو وردەکارییانەی ڕێنووس و ڕێزمانە.

لەبارەی زمانە کوردییەکەمەوە ئەوەیان لە خۆم مەپرسە، بەڵام هەرچی مەسەلەی ڕێنووسە دەتوانم هەر وا بەکورتی دەریببڕم: هەندێ شێوەی نووسینی من هەن کە ڕەنگە بە هەڵە دابنرێن، بەڵام هۆیەکەی ئەوەیە ئەوانە لەو بەشانەی ڕێنووسن کە من خۆیشم هێشتا نەگەیشتوومەتە چارەسەرێکی تەواو و بنجبڕ لەبارەیانەوە. پێیشم خۆشە زێتر کاریان لەسەر بکەم. لەوە بترازێ، دەتوانم بە ئارخەیانی بڵێم کە نووسینی من لە گوێرەی نووسینی دیکە، کەمترین هەڵەی تێدایە. نموونەیەکی بچووک دیوانی (هەموو ڕازی من ئاشکرایە و هەموو ئاشکرای تۆ ڕاز)ە. لەو دیوانەدا، کە ئەوە چوار ساڵ زیاترە بڵاو بووەتەوە، تەنیا یەک هەڵەی تێدایە: لە لاپەڕەی حەوتەمدا نووسراوە (بۆشەوی)، کە دەبوو وشەکان لە یەک جیا بکرێنەوە و بنووسرێ (بۆ شەوی). هەندێ جار پیاو لە کاتی نووسیندا، یا لە کاتی هەڵبژێریدا، هەڵەی بەسەردا تێدەپەڕێ. ئەمەیان نابێ کەسی لەسەر گوللەباران بکرێت.

من دەیان جار و سەدان جار لەگەڵ دۆستەکانمدا، کە بەشێکی زۆریان نووسەر و ڕووناکبیرن، دەکەوینە باسی قووڵ و دووروودرێژەوە لەسەر زمان و ڕێنووس. هەمیشە دەڵێم ئەگەر دەتوانیت بە بەڵگەی زانستی قەناعەتم پێ بکەیت کە من هەڵەم، بەڵێنت دەدەمێ واز لە باوەڕ و هەڵوێستەکەم بهێنم، بەڵام ئەگەر من قەناعەتم بە تۆ کرد، تۆیش بەڵێنێکی وا بە من بدە.

دیمانە: قوتابییەکانی فەرهاد شاکەلی ئەو شانسەیان هەیە کوردییەکی دروست و بێهەڵە فێر بن؟

شاکەلی: ئەوانەی لای من دەخوێنن سەر بە زمان و نەتەوە و فەرهەنگ و وڵاتی جیاوازن. لە ماوەی ئەو هەموو ساڵەدا کە من لە زانستگەی ئوپسالا کارم کردووە، ژمارەیەکی زۆر خوێندکارم هەبوون: سوێدی و فارس و فینلاندی و ئیسلاندی و ئێستلاندی و ئەڵمانی و تورک و کورد و بەلووچ. لەبەر ئەوەیش دەبێ ئەمانە لە پێشدا فێری زمانەکە بکرێن نەک ئەو وردەکارییانەی ڕووناکبیرێکی خۆیشمان تێی ناگات.
مامۆستا هەموو شتێک نییە. من دەتوانم بڵێم ئەگەر خوێندکارێکی وریا و هۆشیاری کورد دوو ساڵێک لای من بخوێنێت و خۆیشی بیەوێت، بەڵێ فێری کوردییەکی زۆر چاک دەبێت. خوێندکاری بێگانەم هەبووە کە لە ماوەی دوو ساڵدا فێری هەردوو شێوەزاری کوردیی باکوور و کوردیی باشوور بووە و توانیویەتی پێیان بخوێنێتەوە. خوێندکاری کوردیشم هەبووە لە ماوەی چوار ساڵدا نەیتوانیوە فێری زاراواکەی دیکە ببێت، واتە ئەوەیان کە پێشتر نەیزانیوە.

ئامادەکردنی: مەجید ئەحمەدی
ماڵپەڕەی دیمانە، ٢٧-١٠-٢٠٠٥
www.dimane.com

# کوردیی خواروو زمانێکی ستانداردە و دەتوانێت نەخشی زمانی ڕەسمیی کوردستان ببینێت

**چاودێر: زمانی ستاندارد چییە و چۆن پێناسەی دەکەیت؟**

شاکەلی: "زمانی ستاندارد" یا "بەستانداردکردنی زمان" یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی زمانناسی (Linguistics) و زمانناسیی کۆمەڵایەتی (Sociolinguistics). ئەم بابەتە زانستییە بە تایبەت لەو وڵاتانەدا بایەخی پێ دەدرێت کە کێشەی بەستانداردکردنی زمان و کێشەی هەبوونی کۆمەڵگەیەکی فرەزمانی و فرەدیالێکتی لە ئارادایە. بەڵام هەر وەک بابەتێکی تیۆرییش گرنگیی خۆی هەیە و لە چوارچێوەی زمانناسی (یا زمانەوانی)دا لە زانستگە پێشکەوتووەکانی دنیادا دەخوێنرێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت. دیارە خوێندنی تیۆرییەک هەر لە پێناوی زانیاریی تیۆریدا و بەکارهێنانی تیۆری وەک ڕێنوێنێک بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی زمانەوانی، کە لە ناوەڕۆکدا کێشەیەکی هەم کۆمەڵایەتی و هەم سیاسیشە، دو شتی جیاوازن. هەر ئەم جیاوازییەیشە (با بڵێین هەر ئەم لەیەکنەچوونەیشە) وا دەکات کە ئێمە دەبێ زۆر بە پارێزەوە لە مەسەلە تیۆرییەکانیش نزیک بکەوینەوە. تۆ ناتوانیت هەروا لە خۆتەوە تیۆرییەک بێنیت و بڵێی با ئەمەیان لە وڵاتانی خۆماندا بخەینە کارەوە، بزانین ئەنجامەکەی چۆن دەبێت. ئەودەم تۆ نەتەوە و نیشتمان دەکەیتە کەروێشکی ئازمایشگە.

وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یەکێتیی سۆڤیێتی جاران، ناوچەی باڵکان، بەشێکی زۆری ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ناوچەکانی هیندۆچین و ئافریقا، لەو ناوچانەن کە کۆمەڵێ ئەزموونی گرنگیان هەبووە و هەیە و دەکرێ مرۆڤ زۆر شتیان لێوە فێر ببێت. بەداخەوە وا پێ

ناچێت لە بواری تیۆریدا سامانێکی باش، وەک ئەنجامگرییەکی ئەم ئەزموونانە، لە بەردەستدا هەبێت. لەم بوارەیشدا زمانەوانانی ئەورووپای ڕۆژاوا لە ڕووی تیۆرییەوە کارێکی زۆریان کردووە. ئەو زمانناسانەی لەم بوارەدا ناوێکیان هەبێت کەم نین، من هەر وەک نموونە لێرەدا ناوی دوو زانای ناودار دەهێنمەوە: ئاینار هاوگن ( Einar Haugen 1906-1994) و چارلز ئا. فێرگەسۆن ( Charles A. Ferguson 1921-1998). بابەتێکی نزیک لە بابەتی ستانداردکردنی زمانەوە "نەخشەبۆدانانی زمانە"، واتە: Language planning، کە لە بەرهەمەکانی فێرگەسۆندا جێگەیەکی دیاری هەیە.
بەستانداردبوونی زمانێک لە ڕاستیدا پرۆسەیەکی هەم دوورودرێژ و هەمیش ئاڵۆزە، کە کۆمەڵێ هۆ و هەلومەرج نەخشی تێدا دەبینن. ئێمە دەتوانین بە زمانێک بڵێین ستاندارد ئەگەر ئەم قۆناغانەی تێپەڕاندبێت: ١. هەڵبژاردنی شێوەیەک، واتە هەڵبژاردنی یەکێک لە دیالێکتەکانی زمانەکە وەک بنەڕەت، وەک نۆرم؛ ٢. کۆداندن (واتە بە کۆدکردنی) ئەو شێوەیە تا ئەو ڕادەیەی کە جیاوازییەکان لە پلەی هەرە کەمتریندا بن؛ ٣. فراوانکردنی بوارەکانی بەکارهێنانی زمانەکە، واتە لە بوارە زانستی و ئەدەبی و ڕۆژنامەگەری و تەکنیکییەکاندا بخرێتە گەڕ؛ ٤. پەژێرتن (قەبووڵکردن) لەلایەن کۆمەڵەوە، واتە کۆمەڵێکی بەکارهێن قەبووڵی بکەن و بە کاری ببەن. ئەم مۆدێلە زیاتر بەرهەمی لێکۆڵینەوەکانی هاوگنە. پرۆفیسۆر ئۆیستەن داڵ (Östen Dahl)ی زمانەوانی سوێدی، بەکارهێنانی زمان وەک زمانی نووسین لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا بە گرنگترین مەرجی زمانی ستاندارد دادەنێت. لەم ڕووەوە دەکرێ بیر و بۆچوونی جیاواز بدۆزینەوە.

**چاودێر: ئایا کورد خاوەنی زمانی ستانداردە و ئەگەر هەیەتی تایبەمەندییەکانی چین؟**

شاکەلی: من وا هەست دەکەم لە کوردستاندا چەمکەکانی ستاندارد و ڕەسمی، زمان و دیالێکت، نەتەوە و ناوچە بە جۆرێک تێکەڵ کراون کە بە ڕاستی بووەتە هۆی سەرلێشێوانێکی زۆر و ناپێویست. بەشێک لەم

ئاژاوەیە کەسانێک دروستی دەکەن کە بۆ مەبەستی تەسکی خۆپەرستانەی خۆیان سوودی لێ وەردەگرن. بەشێکیش بەو هۆیەوە دروست بووە کە لەو باسوخواسانەدا لەبارەی زمانی کوردی و ستانداردبوونی زمانەوە دەکرێن، خەڵکانێکی زۆر بەشداری دەکەن کە بەڕاستی نەخوێندەوارن و لەو بابەتانە بە هیچ جۆرێک سەر دەرناکەن، کەچی هەر خۆیشیان دێننە پێشەوە و قسەیەکی زۆری بێناوەڕۆک و نازانستی هەڵدەڕێژن.

بێگومان زمانی کوردی، بەپێی هەموو پێوەرە زانستییەکان، زمانێکی ستانداردە. ئەم ستانداردبوونەی زمانی کوردی، لێرەدا مەبەستم تەنیا شێوەی کوردیی خواروەوە، لە ئەنجامی پرۆسەیەکی مێژوویی و سیاسیی دوورودرێژدا پێگەیشتووە و بووە بە کەرەستەیەکی دەربڕین لە زۆربەی زۆری بوارە زانستی و ڕۆژنامەگەری و سیاسی و کارگێڕی و ئەدەبییەکاندا. لەناو هەموو شێوە و دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا تەنیا کوردیی خواروەوە کە بەم پرۆسەی ستانداردبوونەدا تێپەڕیوە و گەیشتووەتە قۆناغێک کە دەتوانێت نەخشی زمانی ڕەسمیی کوردستان ببینێت.

لە وەرامی پرسیاری پێشوودا دیتنی هەندێ زمانەوانی ناوداری جیهانم لەبارەی زمانی ستانداردەوە باس کرد. تۆ دەبینی ئەو مەرجانە هەموویان لە کوردیی خوارووودا هەن و بەرچاون. ئەمڕۆ نووسەرێکی جیددیی کورد لە سنە و کرماشان و سابڵاخ بێت، یا کفری و کۆیە، یا قەڵادزێ و خانەقین و باڵەکایەتی، هەموویان، کەموزۆر، وەک یەک دەنووسن. ئەو تێرمینۆلۆگییەی لە کوردستانی عیراقدا چەسپیوە و جێی گرتووە، لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش، بەتایبەت کوردستانی ئێران، بە کار دەبرێت و لەوێیش جێی خۆی گرتووە. تەنانەت لە کوردیی سەروویشدا، کرمانجی، بە سەدان تێرمی کوردیی خواروو چوونەتە ناو زمانەکەوە و جێی خۆیان گرتووە.

سیمایەکی گرنگی زمانی ستانداردی کوردی ئەوەیە کە ئەگەرچی لە سەرەتادا وەک شێوەی ناوچەیەکی بچووکی کوردستان بە کار هێنراوە، بەڵام لە ماوەی نزیکەی دووسەد ساڵی ڕابوردوودا بە

جۆرێکی هێندە زیندوو گەشەی کردووە، کە توانیویەتی وشە و دەستەواژە و دەربڕین لە زۆربەی دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردییەوە وەربگرێت و خۆی پێ دەوڵەمەند بکات، کە ئێستا ئیتر تۆ ناتوانی بڵێیت ئەم زمانە ستانداردە شێوەی ناوچەی سلێمانی یا شارەزوورە، بەڵکە زمانێکی ئەدەبییە کە بەشە جۆراوجۆرەکانی پێکهاتەکەی لە شێوەی ناوچەکانی سنە و سابڵاخ و هەولێر و کۆیە و کەرکووک و گەرمیان و هەورامان و فەیلی و دهۆک و بارزان و ئاکرێ و زاخۆوە وەرگرتووە. چوار ساڵی ئاشتیی ١٩٧٠-١٩٧٤ دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانی ستانداردی کوردی، بەتایبەت کە لە ئەنجامی دووربینی و هۆشیاریی سەرکردایەتیی سیاسیی ئەو کاتەی کوردستاندا، بوو بە زمانی خوێندن و پەروەردە لە سەرتاسەری کوردستانی عیراقدا. لەوەیش بترازێت ئەو دەستگا پەروەردەیی و فەرهەنگی و ڕاگەیاندنانەی لەو ساڵانەدا دامەزرێنران ژێرخانێکی پتەویان بۆ ستانداردبوونی زمانی کوردی داڕێشت و ئەو نەخشەیان زیاتر چەسپاند.

**چاودێر: ئایا پێویستمان بە زمانی ستاندار هەیە و چۆن دێتە ئاراوە؟**

شاکەلی: زمانی کوردی یەکێکە لە فاکتۆرە هەرە گرنگەکانی یەکگرتوویی و مانەوەی نەتەوەی کورد. ئێستا هەلومەرجێک هاتووەتە ئاراوە کە کوردستانی خواروو (خوارووی کوردستان، کوردستانی عیراق!) دەوڵەتێکی دەیفاکتۆیە. ئێمە تازە ئیتر ناکرێ هەر وا هەڵسوکەوت بکەین، وا بزانین هێشتا لە شاخین و ئەرکی زمان هەر ئەوەیە دوو بڵاوکراوەی حیزبیی پێ ڕەش بکەینەوە، یا هەندێ نامەی نهێنیی پێ بنووسین و بینێرینەوە بۆ شانە و لیژنەکانی ناو شار. ئەمڕۆ دەبێ لە سیستەمی خوێندن و پەروەردەدا زمانێکی سەرتاسەریی وەها بە کار ببەین کە وەرامی پێویستییە زانستییەکان بداتەوە. دەبێ دەستگاکانی ڕاگەیاندن هەم ئەرکی ڕووناککردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری جێبەجێ بکەن و هەمیش کۆڵەکەکانی هەبوونی

نەتەوایەتی ئەستوورتر و پتەوتر بکەن. دەبێ لە سیستەمی کارگێڕیدا بە زمانێک بنووسرێت کە هاوولاتییەکی کوردستانی بتوانێت لە هەر جێگە و لە هەر شارۆچکەیەکی کوردستاندا کارەکانی خۆی، بێ کێشە و بێ گرفت، ڕایی بکات. ئەمەیش بێ زمانێکی ستاندارد و دامەزراو و پێشکەوتوو ناکرێت.

ڕاستییەکەی ئەوەیە ئێمە ئەو زمانە ستانداردەمان هەیە و سالانێکیشە ئەو نەخشە دەبینێت. ئەوەی پێویستە بکرێت و بە هیچ جۆرێک نابێ بێدەربەستی و سستیی تێدا بنوێنرێت، ئەوەیە کە دەبێ ئەو زمانە ستانداردە بکرێتە زمانی ڕەسمیی کوردستانی عیراق. دەبێ ئەمە بکرێتە قانوون و بکرێتە بڕیارێکی ڕەسمی و هەرچی زووترە بخرێتە کارەوە.

**چاودێر: کێن ئەوانەی کە دەتوانن بڕیار لەسەر دەستنیشانکردن و هێنانەئارای زمانی ستاندارد بدەن، ئەکادیمیا یا ناوەندەکانی دەسەلات؟**

شاکەلی: من ئەوە سی ساڵە لە ولاتێکدا دەژیم کە نموونەیەکی بەرزی سیستەمی دیمۆکراسییە. لەم ولاتەدا بڕیاردان بە شێوەیەکی تایبەت جێبەجێ دەکرێت و دەبێ بە کۆمەڵێ کەناڵدا تێبپەڕێت تا دەگاتە خواری خوارەوەی کۆمەڵ و ئەوەی پێی دەگوترێت بنجی گیا ( Grass roots). ئەوەیش دەزانم کە ناتوانم و مافی ئەوەم نییە ئەوەندە گەشبین بم وا بزانم لە کوردستانیش دەکرێت بڕیار و گۆڕینەکان بەو جۆرەی لە سوێد هەیە، ببرێن بە ڕێوە.

ئەگەر دەستگا و دامەزراوەکانی کوردستان بە شێوەیەکی باش و سروشتی و زانستانە دابمەزرانایە، دیارە دەکرا ئەو هیوایەمان هەبووایە کە ئەکادیمیای زمان لەو بوارەدا پێشنیازی بکردایە و دەستگا بڕیاردەرەکان (قانووندانەرەکان)یش بڕیاریان لەسەر بدایە. بەلام لە کوردستانی ئەمڕۆدا تۆ دەستگایەکی زانستی و زمانەوانیت نییە شایانی چاوەڕوانییەکی وەها بێت. لە سەردەمی ڕێژیمی بەعسدا "کۆڕی زانیاریی کورد" هەبوو کە زۆر لە دەستگا بەناو زمانەوانی و

فەرهەنگییەکانی ئەمڕۆ کاراتر و زانستانەتر و دڵسۆزتریش بوو. دیارە ئەوە چاکەیەک نەبوو بەعس بۆ کوردی کردبێت، بەڵکە ژیری و دڵسۆزیی سەرکردایەتیی ئەو کاتەی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد چەسپاندبووی. ئەو دەستگایەی ئەمڕۆ ناوی خۆی ناوە ئەکادێمیای کوردستان گاڵتەجاڕییەکە، بەڕاستی مایەی ڕیسوایی و شەرمەزاری و داوەشانە. دەبێ نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی نەزۆک و دارێکی زڕ و بێبەر بێت کە ئەمە دەستگای هەرە باڵای زمانەوانیی کوردستان بێت.
لەم بارە یەکجار نالەبار و ئاژاوەیەی ئەمڕۆی کوردستاندا، من پێم وایە چارەسەر هەر ئەوەیە کە سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستان کۆمەڵێک خەڵکی شارەزا و دڵسۆز، لە دەرەوەی دەستگا ڕەسمییەکان، کۆ بکاتەوە (مەرج نییە هەموویشیان زمانەوان بن)، ڕاوێژ و هاوپرسەکییان لەگەڵ بکات و بڕیاری ئەوە بدات کە زمانی ستانداردی کوردی ببێتە زمانی ڕەسمیی کوردستان و یەکسەریش بخرێتە کارەوە. لەمە بەولاوە هەر بیرێکی تر و هەر ڕێگەچارەیەکی دیکە ئەنجامەکەی هەر ئەو گاڵتەجاڕی و ئاژاوەیە دەبێت کە ئەوە شانزدە ساڵە سەرتاپێی کۆمەڵی کوردەواریی داپۆشیوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەشەنە دەکات و وەک ڕەگی گولی بە لەشی نەتەوەیەکدا دەچێتە خواری.

**چاودێر: ڕات چییە دەربارەی خوێندن بە دوو زاری زمانێک بۆ نەتەوەی کورد لە ڕووەکانی زانستی و پەروەردەیی (کەسێتی و سایکۆلۆژی) و ڕامیاری و ئاسایشی نەتەوەییەوە، کە ئێستا وەزارەتی پەروەردە لە پرۆگرامی نوێی خوێندنی هەرێمی کوردستاندا جێبەجێی کردووە؟**

شاکەلی: سیستەمی خوێندن و پەروەردە یەکێکە لەو بوارە گرنگانەی کە زمانی ستاندارد پەرە پێ دەدات و بەهێزی دەکات و دەیچەسپێنێت. بەکارهێنانی یەک زمان و یەک شێوە تاکە ڕێگایە بۆ وەدیهێنانی ئامانجێکی وەها. لە کوردستانی عیراقدا، لەو ڕۆژەوە کە مافی خوێندن

بە زمانی کوردی لە دەستووری عیراقدا چەسپیوە، هەر یەک شێوە کراوەتە زمانی خوێندن و ئەمەیش نەوەیەکی خوێندەواری دروست کرد کە لە زۆر ڕووەوە یەکگرتوو بوو. ئەنجامێکی گرنگی دیکەی ئەو سیستەمە ئەوە بوو کە هەستی خۆبەکوردزانین، واتە هۆشیاریی نەتەوایەتیی لای مرۆڤی کورد بەهێز کرد. ئەو هۆشیارییە دەستکەوتێکی گەورەی مێژوویی بوو، کارکردەکەیمان لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤دا، لە شۆڕشی ١٩٧٥دا و دواتریش لە ئەنفال و کۆڕەوەکەی ١٩٩١دا بینی. ئەوە پێوەستبوونی نەتەوایەتی بوو کە میلیۆنان کوردی پێکەوە بەستبوو، هەستیان بە یەکێتیی و هاوزمانی و هاوئامانجی دەکرد، هەستیان بە هاودەردی و هاومەینەتی و هاوچارەنووسی دەکرد، هەستیان دەکرد هەموویان کوردن و سەر بە یەک نەتەوەن. ئەوە تەنیا سیاسەت نەبوو ئەو شەپۆلە و ئەو لافاوەی کوردایەتیی دروست کردبوو، بەڵکە زمان لەو ڕووەوە نەخشێکی گەورەی هەبوو.

بەکارهێنانی سیستێمێکی دووزمانە لە بواری خوێندن و پەروەردەدا، دژی یەکێتیی نەتەوە و نیشتمانە و دژی بنەما زانستییەکانی پەروەردەیە. ئەگەر ئێمە خۆمان بە یەک نەتەوە دەزانین، دەبێ یەک زمانیش بخوێنین. دەزانم، لە وڵاتی ئێمەدا تا ئێستایش ناڕوونییەک هەیە لەبارەی سنووری نێوان زمان و دیالێکتەوە. زۆرجار ئەوەم بەرچاو دەکەوێت کە گوایە لە بەلژیک سێ زمان دەخوێنرێت و لە فینلاند دوو زمان و لە سویسرا سێ زمان، بەڵام ئەو کەسانە ئەوە تێنەگەیشتوون کە ئەو زمانانە زمانی نەتەوەی جیاوازن، واتە ئەو خەڵکانە لە ڕووی ئێتنیکییەوە سەر بە نەتەوە و ڕەگەزی جیاوازن. بنەما ئەوەیە کە هەر نەتەوەیەک یەک زمانی ستانداردی هەیە و ئەو زمانە دەبێتە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت و لەبوارەکانی خوێندن و کارگێڕیی دەوڵەت و ماسمیدیای ڕەسمیدا بە کار دەهێنرێت. هەبوون و بەکارهێنانی زمانی ستاندارد مەعنای ئەوە نییە ئیدی هەموو دیالێکتەکانی دیکەی زمان بخرێنە لاوە و قەدەغە بکرێن. ئەو دیالێکتانە دەمێنن و دەتوانن درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن و سامانی ئەدەبی و

زمانەوانییان لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستیدا بخوێنرێت. هەروەهایش هەر ناوچەیەک دەتوانێت لەپاڵ ڕاگەیاندنی سەرتاسەریی وڵاتدا، دەستگای ڕاگەیاندنی بۆ ناوچەکەی خۆی و بەو شێوەزمانە هەبێت؛ ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن و ڕۆژنامە و چاپەمەنیی دیکەیش.
ئێستا کە وەزارەتی پەروەردەی کوردستان دەیەوێ سیستەمی دووزمانە بخاتە کار، ئەمە دژایەتیکردنی مێژووی کورد و هۆشیاریی نەتەوایەتیی کورد و هەستی نیشتمانپەروەرییە. من نازانم کێ بڕیارێکی وەهای دەرکردووە، بەڵام، گرنگ نییە، هەرکێیەک بێت، دەبێ بڵێم هەڵەیەکی مێژوویی و سیاسیی گەورەی کردووە. هێندەی من بزانم و بەڕێز وەزیری پەروەردە بناسم، ئەو وا بیر ناکاتەوە و دژی سیستەمی دووزمانەیە، بەڵام بەرانبەر لادان و لەڕێدەرچوونێکی وا گەورە، بۆچی بێدەنگە؟ هیوادارم کورسییەکەی خۆی لە زمانی کوردی و یەکێتیی نەتەوەی کورد لە لا خۆشەویستتر و پیرۆزتر نەبێت.

**چاودێر: کردنەوەی ناوەندەکانی وەرگێڕان و فەرهەنگ و زاراوەسازی لە کوردستاندا، تا چەند کاریگەریی دەبێت لە هێنانەئارای زمانی ستانداردی کوردی؟ پێت وا نییە دەسەڵاتی کوردی لەم بوارەدا کەمتەرخەمە؟**

شاکەلی: ئێمە ئەگەر لەبارەی دەستگا و ناوەندی جۆربەجۆری فەرهەنگییەوە قسە بکەین، دەبێ **هەموو** باسەکە لە یەک چوارچێوەدا کۆبکەینەوە، ئەویش چوارچێوەی **سیاسەتی** فەرهەنگییە (السیاسة الثقافیة، Cultural policy). سیاسەتی فەرهەنگی ئەو ستراتێگییە زانستی و سیاسی و کارگێڕییەیە، ئەو نەخشەی ڕێگایەیە کە هەوڵ دەدات فەرهەنگ وەک سامانێکی نەتەوایەتی و وەک بەرهەمێکی نەتەوایەتی تەماشا بکات و نەخشە دادەنێت بۆ پێشخستن و پەرەپێدان و گەشەکردنی. ئەم نەخشەیە لە چوارچێوەی سیاسەتێکی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەرانەدا و بەپێی قۆناخی مێژوویی دادەڕێژرێت، چونکە

ئامانجی سیاسەتی فەرهەنگی لە قۆناخێکەوە بۆ قۆناخێک دەتوانێت بگۆڕێت.

دەستەڵاتی سیاسیی کوردستان، کە شانزدە ساڵە بەرپرسی سەرلەبەری کاروباری کوردستانە، تا ئێستا سیاسەتێکی فەرهەنگیی نییە و لەو ڕووەیشەوە هیچ نازانێت، چونکە دەستەڵاتێکی نەخوێندەوارە. ئێمە ئەگەر تەماشایەکی کارەکانی کۆمەڵە دەستگایەکی فەرهەنگیی کوردستان بکەین: زانستگەکان، وەزارەتی فەرهەنگ [ئەوان پێی دەڵێن ڕۆشنبیری، کە دیارە هەڵەیە]، ئەکادێمیای کوردی، وەزارەتی پەروەردە، وەزارەی خوێندنی باڵا، دەستگا ناوەندییەکانی ڕاگەیاندن... و چەندی دیکەیش، دەبینین ئەمانە بە شێوەیەکی ئەزموونگەرانە کار دەکەن، واتە هیچ ستراتێگی و هیچ بیرکردنەوەیەکی دوورخاییێنیان نییە و نەخشەیەکیان بۆ داهاتوو نییە. بەرهەمی ئاژاوە و بێسەروبەرییەکی وەها ئەو داڕووخان و هەڵوەشانەوە و داتەپینەیە کە فەرهەنگ و زمانی کوردی تووشی بووە. پێت سەیر نەبێ کە من تا ئێستا لە چەندین دیداردا وتوومە و دووبارەیشی دەکەمەوە، بێ ئەوەی ناهەقییەکم کردبێت، ئەمڕۆ لە کوردستاندا یەک تاکە کتێب، یەک تاکە گۆڤار، یەک تاکە ڕۆژنامە و حەفتەنامە و مانگنامە و وەرزنامە نییە کە بە کوردییەکی ڕاست و بە ڕێنووسێکی ڕاست نووسرابێت.

پێشنیازی کردنەوەی ناوەندی وەرگێڕان و فەرهەنگ و زاراوەسازی، ئەگەرچی پێشنیازی باش و پێویستە، بەڵام هیچ دەردێکی فەرهەنگی هەڵوەشاوە و داڕووخاوی کوردستان دەرمان ناکات. ئەگەر مەسەلە هەر دامەزراندنی ناوەند و دەستگای جۆراوجۆر بێت، ئەوا ئێستا لە کوردستاندا دەیان دەستگا هەن و لە ڕووی بودجە و کارمەند و باڵاخانە و کورسی و قەنەفەوە لە دەستگا فەرهەنگییەکانی ئەورووپا ئەگەر چاکتر و جوانتر نەبن، کەمتریش نین. بەڵام ئەم دەستگا و هەیتوهووتانە پێویستیان بە مێشکە، پێویستیان بە هۆشیاری و ئاوەزێکی بەرز و زانستی و دووربین و دڵسۆز و لێزانە. دەبێ سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستان فێری ئەوە ببێت گوێ لە کەسانی شارەزا و دڵسۆز بگرێت، دەست بکاتە

لێکۆڵینەوەی جیدی لەبارەی فەرهەنگی کوردەوە و لە ئەنجامدا ستراتیگی و نەخشەیەکی درێژخایێن دابنێت، واتە سیاسەتێکی فەرهەنگی ( Cultural and educational policy) دابرێژێت. لە چوارچێوەی سیاسەتێکی وەهادا دەکرێت بیر لەوە بکرێتەوە ئەو دەستگا و ناوەندانەی پێویستن و دەبێ بێنە دامەزراندن چین و کامانەن.
لە بواری سیاسەتی فەرهەنگیدا ئەزموونی زۆر و زەبەندی گەلان و دەوڵەتانی دنیامان لە بەردەستدایە و دەتوانین سوودیان لێ وەربگرین و بەپێی هەلومەرجی کوردستان و بەپێی پاشخانی ماددی و ڕۆحیی نەتەوەی کورد لەو نموونە جیاوازانە کەڵک وەربگرین و بیانخەینە کار. دەتوانین ئەزموونی ڕووناکبیرانی جیدی و شارەزای کورد، چ لە ڕۆژاوا و چ لە کوردستان، بکەینە گەنجینەیەک و سەرمایەیەک لەو پێناوەدا بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە.

**چاودێر: ڕۆڵی سیاسی و مێژوویی زمان چییە بۆ سەربەخۆیی نەتەوەی کورد؟**

شاکەلی: سەربەخۆیی تێرمێکی سیاسیی ڕووت و ئابستراکتە، بەڵام بەڕێوەبردن و مومارەسەکردنی سەربەخۆیی پێویستی بە کۆمەڵێ دەستگا و ڕێکخراو و چەمک و بیر و هۆشیارییە کە لە سەرخان و ژێرخانی وڵاتێک و نیشتمانێکدا جێگەیان هەیە و کارکردیان دەبێت. زمانیش یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی هەبوون و پێشکەوتنی نەتەوە و نیشتمان. ئێمە ئەگەر بمانەوێ هەم کۆمەڵی خۆمان پێش بخەین و بیکەینە بەشێکی زیندووی شارستانەتیی ئەمڕۆی جیهان و هەمیش لەو شارستانەتییەدا بەشدارییەک بکەین و جێدەستمان دیار بێت، بێ زمانێکی تۆکمە و دەوڵەمەند و زیندوو ناتوانین ئەو بەشدارییە بکەین. کەواتە دیسان دەگەڕێینەوە بۆ سەر ئەو بیر و پێشنیازانەی لە وەرامی پرسیارەکانی پێشوودا پێشکەشم کردن لەبارەی زمانی ستاندارد و گرنگیی زمانێکی وەهاوە بۆ دروستبوونی نەتەوە. ئەم بیرانە هەموویان بە شێوەیەکی زۆر توندوتۆڵ و ئۆرگانیک پێکەوە بەستراون و کار لە یەکدی دەکەن.

# زمانی کوردی لە ئاستانەی سەردەمێکی تازەدا

لە ماوەی دوو سێ ساڵی ڕابوردوودا سەدان وتار و لێکۆڵینەوە و دیداری ڕۆژنامەوانی لە دەستگاکانی ڕاگەیاندنی کوردستان و ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێتدا لەسەر کێشەکانی زمانی کوردی بڵاو کراونەتەوە. سیمای هەرە زاڵی بەشێکی یەکجار زۆری ئەو نووسین و بابەتانە ئەوە بووە کە لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە نەنووسراون و بەڵگەهێنانەوە و هاوپرسەکییەکان بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی تەسکی ئیدیۆلۆگی و سیاسی بوونە، کە هیچ پێوەندییەکیان بە زمانەوانی و باسەکانی زمانی کوردییەوە نەبووە. لێکۆڵینەوەی زانستی، لە پاڵ ئامانجێکی بنەڕەتیدا کە گەیشتنە بە ڕاستی و دروستکردنی چەمک و تێگەیشتنێکی وەهایە کە ببێتە بنەمای پێشکەوتن و گەشەکردن لە دیسیپلینە جۆراوجۆرەکانی زانستدا، ئەو بەرزویستییەیشی هەیە کە لە چوارچێوەی بابەتێکی کێشەئاسادا دەوڵەمەندییەکی زانیاری دروست بکات. ئێمە کە ئەو نووسینانەی لە بواری کێشەکانی زمانی کوردیدا نووسراون و دەنووسرێن بە سەر دەکەینەوە، دەبینین هیچ مەرجێکی زانستییان تێدا ڕەچاو نەکراوە. ڕەنگە تاکوتەرا نووسین هەبن کە ڕیزپەڕن و ناکەونە بەر ئەو هەژارییە زانستی و ئیپیستێمۆلۆگییەی کە بووەتە دیاردەیەکی ئاشکرا و سەردەست لە ئەمڕۆی فەرهەنگی کوردیدا.

بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەی لێرەدا بڵاو دەکرێتەوە، زمانە، زمانی کوردی، و بەسەر دوو پرسیار، یا دوو کێشەدا دابەش دەبێت:

## یەکەم: ئەلفوبێ

کورد دەبێ چ ئەلفوبێیەک بە کار ببات؟ ئەو ئەلفوبێیەی کە چەند سەدەیەکە بە کاری دەهێنێت و هەموو ئەدەبی کلاسیکی کورد و بەشی هەرە زۆر و گرنگی ئەدەبی تازەیشی پێ دەنووسرێت؟ یا ئەو ئەلفوبێ لاتینی تورکییەی کە نزیکەی ٦٠ تا ٧٠ ساڵێکە دامەزرێنراوە، بەڵام تەنیا لە ماوەی ١٥-٢٠ ساڵی ڕابوردوودا بە شێوەیەکی سنووردار، لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بە کار هێنراوە و بەشێکی یەکجار کەمی ئەدەبی کوردی، بە زاراوای کوردیی باکوور، پێ دەنووسرێت؟ ئەم دوو ئەلفوبێیە لە ڕووی دەنگەوە تا چ ڕادەیەک وەرامی پێویستییەکانی زمانی کوردی دەدەنەوە؟ ئایا بە کردەوە، دەکرێ نەتەوەیەک هەروا بەئاسانی واز لە ئەلفوبێیەک بهێنێت و دەست بکاتە بەکارهێنانی ئەلفوبێیەکی دیکە؟ ئایا کارێکی وەها تا چ ڕادەیەک زیان بە نەوەکانی داهاتوو دەگەیێنێت و لەو گەنجینە فکری و ئەدەبی و زانیارییەی ئەمڕۆ چەندی دەگاتە دەستی ئەوان؟ لەم ڕووەوە هەم ئەزموونی بەشی هەرە زۆری گەلانی دنیامان لە بەردەستدان، کە خاوەنی فەرهەنگ و شارستانەتیی دێرین و دەوڵەمەندن و لە دنیای ئەمڕۆیشدا، لە پلەیەکی یەکجار بەرزی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگیدا نەخشیان هەیە، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری فەرهەنگ و شارستانەتیی خۆیان، کە ئەلفوبێ یەکێکە لە کۆڵەکە پتەوەکانی، نەبوون، هەمیش ئەزموونی تورکیای "بەناو" مۆدێرن و تازە، کە بە هۆی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە، ئەلفوبێی لاتینیی بەسەر گەلانی تورکیادا سەپاند و بە ناوی تازەکردنەوە و نزیکبوونەوە لە ئەورووپاوە، نەتەوەی تورکی لە فەرهەنگ و شارستانەتیی ڕۆژهەڵات دوور خستەوە، بەڵام هەرگیزیش نەیتوانی ببێت بە ئەورووپایی.

## دووەم: زمانی ستاندارد، یا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو

ئایا دەتوانین بڵێین کوردی زمانێکی ستاندارد و یەکگرتووە؟ ئایا ئەو دوو شێوە ئەدەبییەی کە ئێستا لە ئارادان، هەر یەکەیان زمانێکی ئەدەبی و ستانداردە، یا دەتوانێت ئەو ڕۆڵە ببینێت؟ ئایا دەبێ کورد یەکێک لەم دوو شێوەیە هەڵبژێرێت، یا بە تێکەڵکردنی هەردوویان زمانێکی تازە و جیاواز "دروست بکات؟" ئایا هەر چارەسەر و ئەنجامگرییەک ئەمڕۆ ئێمە لە کوردستانی خواروودا (خوارووی کوردستان یا کوردستانی عیراق) پێی بگەین، تا چەند بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستان گرنگە و دەکرێ پێڕۆی بن؟ لەم جۆرە پرسیارانە زۆرن و بەشی هەرە زۆری ئەو کەسانەی لە دوو سێ ساڵی دواییدا، لەم بوارەدا دیداریان لەگەڵ کراوە، یا وتاریان نووسیوە، لێی نزیک کەوتوونەتەوە و هەوڵیان داوە بەپێی بۆچوونی خۆیان وەرام بدەنەوە و بابەتەکە دەوڵەمەند بکەن.

لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی بابەتی ئەلفوبێ و زمانی ستاندارد، هەر بەوە نابێت کە نووسەرێک یا ڕووناکبیرێک بەپێی حەز و میزاج، هەڵوێست لەبارەیەوە وەربگرێت. ئەم بابەتە ڕەگوڕیشەیەکی زانستی و سیاسی و مێژوویی و فکریی قووڵتری هەیە و بە سەدان دەزووی فەرهەنگی و ئیدیۆلۆگی و زانیاری بەستراوە بە ئێستا و داهاتووی نەتەوە و نیشتمانێکەوە کە هێشتا لە سەرەتای خۆدروستکردن و خۆپێگەیاندندایە.

ئەگەرچی کێشەی ئەلفوبێ پێشتریش هەندێ جار بووەتە بابەتی گوتوبێژ و نووسین، بەڵام لەبەر ئەوەی بازنەی خوێنەر و خوێنەواری وەک ئەمڕۆ فراوان نەبووە، باسەکە هەر لەناو دەستەیەکی ڕووناکبیر و نووسەردا ماوەتەوە. تەنانەت لە بەرهەمی ئەو گوتوبێژانە تەنیا چەند وتارێکی کەم ماوەتەوە و گەیشتووەتە ئێمە. ئەو وتارانەیش تا ڕادەیەکی زۆر لە کرۆکی ڕاستەقینەی باسەکەوە دوورن و تەنیا جۆرێکن لە پێداهەڵدان یا هێرشبردنەسەر، بێ ئەوەی شۆڕ ببنەوە بۆ ناو ڕەگە زانستییەکانی بابەتەکە.

زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، یا زمانی ستاندارد، وەک هەندێ لە لێکۆڵەرەوان پێیان خۆشە ناوی لێ بنێن، ڕەنگە لە بازنەیەکی فراوانتردا باس و گوتوبێژی لەسەر کرابێت. ئەو نووسەر و ڕووناکبیر و زمانزانانەی بەشدارییان تێدا کردووە، نەک تەنیا لە ڕوانگەیەکی زانستی و زمانەوانییەوە لێی کۆڵیونەتەوە، بەڵکە هەوڵیان داوە باسەکە ببەستنەوە بە پاشخانی مێژوویی و ئاسۆ سیاسی و شارستانەتییەکانی دواڕۆژی کوردیشەوە. وا پێ دەچێت لە کۆنگرەی مامۆستایانی کوردیشدا لە شەقڵاوە، هاوینی ۱۹۵۹، ئەم دوو باسە؛ زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و ئەلفوبێ، گرنگترین بەشی بەرنامەکانی کۆنگرەکە بووبێتن. دوای ڕووخان و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانی، کوردستانی باشوور، یا کوردستانی عیراق، تاکە بەشێکی کوردستان بووە کە تێیدا مەسەلەی زمانی کوردی و خوێندن بە زمانی کوردی و ئەو بابەتانەی سەر بەو باسەن، بوونبێتنە بڕگەیەک لە بەرنامەی کاری نووسەران و ڕووناکبیران و سیاسەتمەداران و ڕێکخراوە سیاسییەکانیشدا. ئەو گەشەکردنە فەرهەنگییە فراوانەی لەو بەشەی کوردستاندا ڕووی داوە، پێویستیی گوتوبێژێکی وەهای هێناوەتە گۆڕێ، بەڵام دیسانیش هەرگیز نەبووەتە باسێکی وەها گەرم و گشتگر کە ڕووبەڕووبوونەوەی لێوە پەیدا بووبێت. لە ساڵانی یەکەمی دروستبوونی سیستەمی کۆماریدا لە عیراق، ڕەنگە گرنگترین سەکۆیەک ئەم باسەی لەسەر کرابێت، کۆنگرەی مامۆستایانی کورد بووبێت لە شەقڵاوە.[16] ساڵی ۱۹۷۰یش کە ڕووبەری بەکارهێنانی زمانی کوردی وەک زمانێکی ڕەسمی لە عیراقدا و وەک زمانی خوێندن و فەرهەنگ لە کوردستاندا، زۆر فراوانتر بوو، لەوانە بوو باسێکی وەها ببووایەتە هۆی کێشە و ئاژاوەیەکی زۆر لەناو نووسەران و ڕووناکبیران و دەستەڵاتداراندا، بەڵام سەرکردایەتیی سیاسیی ئەو کاتەی کورد بە شێوەیەکی زۆر ژیر و دووربینانە، ڕێگەی لەوە گرت ئەم بابەتە ببێتە بەرەیەکی تر، بۆ

---

[16] محەمەد، ڕەوشت (ئامادەکار): ئەلفبێی لاتینی...زمانی ستاندارد، بەرگی یەکەم، پرۆژەی تیشک، سلێمانی ۲۰۰۸، ل: ۳۰-۳۱، هەروەها گەلێ بەشی دیکەی ئەو کتێبە.

ئەوەی دوژمنێکی دڕندەی وەک بەعس لێیەوە دزە نەکات و بۆ سوودی خۆی بە کاری نەهێنێت.
ئەمڕۆ کە باشووری کوردستان وەک هەرێمێکی فیدێرال لە ڕووی سیاسی و کارگێڕی و فەرهەنگییەوە تا ئەندازەیەکی باش سەربەخۆیی و پێشکەوتنی بە دەست هێناوە، بێگومان مەسەلەی زمان دەبێتە یەکێک لە بابەتە هەرە گرنگەکانی ئێستا و پاشەڕۆژی کوردستان. ئەوەی ئەم سەردەمەی لە سەردەمەکانی پێشوو بە تەواوی جیا کردووەتەوە ئەوەیە کە پێوەندیی فەرهەنگی و سیاسی لەگەڵ پارچەکانی دیکەی کوردستاندا لە ئاستێکی بەرزتر و گەرمتر و چڕتردایە. هەلومەرجی فەرهەنگی و بەکارهێنانی زمانیش لەو بەشانەی کوردستاندا لە گوێرەی جاران زۆر گۆڕاوە. ئێستا لە هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستاندا زمانی کوردی، ئەگەر بە ڕادەیەکی کەم و سنووردداریش بێت، بۆ نووسین و بڵاوکردنەوە بە کار دەبرێت، هەرچەندە ناکرێ ئەو بەکارهێنانەی ئەوێ لەگەڵ پێشکەوتنی یەکجار فراوان و بەرچاوی زمانی کوردی لە کوردستانی عیراقدا بەراورد بکرێت. ئەنجامێکی مەنتیقیی ئەم ڕاستییەیش ئەوەیە کە هەر بڕیارێک لەم ڕووەوە بدرێت و هەر گەشەکردن و پێشکەوتنێک بە دی بهێنرێت، ڕاستەوخۆ بێت یا ناڕاستەوخۆ، کار دەکاتە سەر بەشەکانی دیکەی کوردستانیش. هەر بەم پێیەیش ڕووبەری باسەکە و بازنەی بەشداریکردن لە لێکۆڵینەوەکاندا هێندە فراوانە کە لە مێژووی فەرهەنگیی کوردستاندا هەرگیز هاوشێوەیەکی نابینین.
ئەم فراوانبوونە ڕەنگە وا لێک بدرێتەوە کە نیشانەیەکی ساغ و سەلامەتیی کەشی فەرهەنگییە و ئەوە پیشان دەدات کە کۆمەڵگەی خوێندەواری کورد بابەتە گەرم و ناوەندییەکان لە ڕێگەی گوتوبێژی زانستی و بە شێوەیەکی شارستانانە یەکالا دەکەنەوە. بە خوێندنەوەی بەشێک لەو وتار و لێکۆڵینەوە و نووسینانەی لەم بوارەدا دەنووسرێن و بڵاو دەکرێنەوە، هەر زوو تووشی بێئومێدی دەبین، چونکە بەدەگمەن هەڵدەکەوێت نووسینێک بخوێنیتەوە بە بیرێکی زانستی و بەپێی پێوەرە زانستییەکانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە نووسرابێت.

مەرج نییە ئەوەی باسی زمان دەکات، دەبێ هەر زمانەوان بێت، بەڵام مەرجە باییی ئەوە شارەزای ئەو زانستە بێت کە لە ڕووی بەڵگە و بەڵگەکارییەوە پشت بە بنەماکانی تیۆرییە زانستییەکان ببەستێت. شارەزایی لە زانستێکدا، بە لای منەوە، هەرگیز مەعنای ئەوە نییە ئێمە هەموو بنەما و هەموو ئەنجامگرییەکانی ئەو زانستە و ئەو تیۆرییانەی سەر بە زانستەکەمان پێ ڕاست بێت و شوێنی بکەوین. ئەمە بەتایبەت لە بواری زانستە مرۆڤانەکاندا (The humanities) ڕاستە. بەڵام خۆبەستنەوە بە مێتۆدۆلۆگیی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە و پێڕۆییکردنی بنەماکانی مەنتیقی زانستی لە باسێکدا کە ڕەگوڕیشەی بەستراوە بە زانستەوە گرنگ و پێویستە. من خۆیشم کە ئەم قسەیە دەکەم، خۆم بە زمانەوان/زمانزان دانانێم، ئەگەرچی لە ماوەی بیستوپێنج ساڵی ڕابوردوودا هەوڵم داوە شارەزایی لە زمانزانیدا پەیدا بکەم و خۆم فێر بکەم.

ڕەنگە خوێنەری ئەم نووسینە بۆ ئەوە بچێت کە ئەم ئاژاوەیەی من باسی دەکەم لەبەر ئەوە بێت کە زمانی کوردی خۆی زمانێکی سەرەتایی و پرشوبڵاوە و بەپێی بنەماکانی ڕێزمان و لێکسیکال و گۆکردن کاری بۆ نەکراوە و، ناکرێ داوای ڕێکوپێکییەک بکەین کە دروست نەبووە. بیرکردنەوەیەکی وەها، بێگومان، دوورە لەو ئەنجامگرییانەوە کە زانستی زمان پێمان دەڵێت. نەخشی زمان، تەنانەت زمانی قسەکردنیش، نیشاندەری گرۆ و ناسنامەیە. ئەندامی کۆمەڵێک ئەگەر ماوەیەک لە کۆمەڵەکەی خۆی دوور بکەوێتەوە، کاتێ دەگەڕێتەوە ناو ئەندامانی کۆمەڵەکەی خۆی و قسە دەکات، یەکسەر هەستی پێ دەکەن کە شێوەی قسەکردنی گۆڕاوە. ئەم نۆرمە زمانەوانییە دەبێتە پێوەرێک بۆ ئەوەی ئەندامێکی کۆمەڵەکە باسی زمانی "خۆمان" و زمانی "ئەوان" بکات.
لە کۆمەڵێکدا کە زمانی نووسینی هەبێت و سیستەمێکی پێشکەوتووی خوێندن و پەروەردەی تێدا دامەزرابێت، چەمکی "زمانێکی ڕاست" بە شێوەیەکی ڕەهاتر وەردەگیرێت: ئەو زمانە شێوەیەکی ڕاستی قسەکردن و تەنانەت نووسینیشی هەیە، کە خەڵکە "خوێندەوارەکە" بە

کاری دەهێنن. واتە ئەوەی وەک ئەوان قسە بکات و وەک ئەوان بنووسێت ڕاستە. ئەوە ئەو شێوە ڕاستەیە کە لە خوێندنگەکاندا دەخوێنرێت و کۆد دادەنرێت (واتە بنەما و ڕێوجێ دادەنرێت) بۆ ڕێزمان و فەرهەنگەکەی. هەروەها ئەکادیمیا و ئەنجومەن بۆ مشتومالکردن و چاودێریکردنی زمانەکە دروست دەکرێن. هەموو ئەم هەنگاوانە بەشێکن لە پرۆسەی پەیدابوونی زمانی ستاندارد.

لە کوردستاندا زۆر دەمێکە ئەو پرۆسێسە بە ڕێوە چووە و بەرهەمێکی باشیشی هەبووە، واتە ئەو زمانە کوردییە ستانداردەی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە کاری بۆ کراوە و لە چل و پەنجا و شەستەکاندا بنەڕەتەکانی داڕێژران و لە سەرەتای حەفتاکاندا گەیشتە پلەیەکی یەکجار بەرزی ڕێکوپێکی و ستانداردبوون. بەرهەمێکی ئەو هەموو کۆششەی سەدەی ڕابوردوو ئەوە بوو کە کۆمەڵێک نووسەر و ڕووناکبیری گەورە دروست بوون، کە دەتوانین بڵێین "کوردیی ڕاست" ئەوەیە ئەوان نووسیویانە و دەینووسن. ئەمڕۆیش دیسان ئێمە کۆمەڵێک نووسەر و ڕووناکبیرمان هەن کە زمانی نووسینی ئەوان زمانی ستانداردی کوردییە. من کە تێکستێک یا کتێبێک دەخوێنمەوە و دەڵێم ئەمە کوردییەکی خراپە، یا ئەمە کوردییەکی باشە، بەڕاستی لە مێشک و بیرکردنەوەمدا پێوەرێکی زمانەوانی و ئێستێتیکی هەست پێ دەکەم و پەنای بۆ دەبەم و دەیکەمە بڕیاردەری ڕاستی و ناڕاستیی زمانی کوردی. ئەو پێوەرە زمانەوانییە هەر ئەوەیە کە لە بەرهەمی نووسەرە گەورە و کوردیزانەکانەوە هەڵهێنجراوە و بووەتە بنچینەی زمانی ستانداردی کوردی.

ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا ڕوو دەدات ڕووخاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەستکەوتە گەورە نەتەوایەتییەیە، واتە هەڵوەشاندنەوەی زمانی ستانداردی کوردی، لەبەر هەندێ بەرژەوەندی تەسک و بێنرخی ناوچەیی و سیاسی و ئیدیۆلۆگی. لە کاتێکدا سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستان لە شەست و حەفتاکاندا (مەبەستم بارزانیی گەورەیە) زۆر ژیرانە پشتیوانیی ئەو پرۆسێسەی

ستانداردبوونەی دەکرد و دەیچەسپاند، سەرکردایەتیی سیاسیی ئەمڕۆی کوردستان ڕێک بە پێچەوانەی ئەوساوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، یەک بە یەک بنەما و کۆڵەکەکانی ئەو زمانە ستانداردە دەڕووخێنێت و هەڵدەوەشێنێتەوە. ئەو دەستگا بەناو زانستییانەی سەرکردایەتیی سیاسیی ئەمڕۆی کوردستان دایمەزراندوون، هەر هەموویان خزمەتی ئەو ڕووخاندن و هەڵوەشاندنەوەیە دەکەن. ئەنجامی ئەم بارە کارەساتئامێزە ئەوەیە کە پێوەری زمانی ستانداردی کوردی و "کوردییەکی ڕاست" تەنیا تێکست و نووسینی ئەو نووسەر و ڕووناکبیرانەیە کە بەرهەمی ئەو سەردەمەی ڕابوردوون و ژمارەیشیان، ئەگەر زۆریش بە گەشبینی تەماشای بکەین، ڕەنگە خۆی بدا لە پانزدە بیست کەسێک. دەستگا زمانەوانی و پەروەردەیی و فەرهەنگی و بەناو زانستییەکانی ئەمڕۆی کوردستان زۆر لەوە لاوازترن بتوانن جارێکی دیکە ڕووناکبیر و نووسەری وەها بەرهەم بهێنن.

بەشی زۆری نووسەر و ڕووناکبیرانی شارەزای کورد بەگشتی لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو شێوەزمانەی ئێستا لە کوردستانی عیراق و تا ڕادەیەکیش لە کوردستانی ئێراندا ڕۆڵی زمانی ستاندارد (و ڕەسمی) دەبینێت، تاکە شێوەیەکی زمانی کوردییە کە دەتوانێت و دەبێ بکرێ بە زمانی ڕەسمیی کوردستان. کە باسی کوردستانیش دەکەن مەبەستیان هەموو کوردستانە، واتە ئەو بەشانەیش کە ئەمڕۆ بواری بەکارهێنانی زمانی کوردییان تێدا نییە. بەڵام هەر لەناو ڕووناکبیر و نووسەراندا کەسانێک هەن ئەوە جەخت دەکەن کە ئەوان باس لە کوردستانی عیراق دەکەن، بەو پێیەی کە تەنیا لەو بەشەی کوردستاندا زمانی کوردی ستاتووسێکی ڕەسمیی هەیە و ناکرێ ئێستا باسی بەشەکانی دیکەی کوردستان بکەین. دەبێ سەرنجی ئەوەیش بدەین کە تەقریبەن هەر هەموو ئەو شارەزایانەی لەبارەی زمانی کوردییەوە دەنووسن، ناونانی ئەو شێوەزمانە بە "سۆرانی" بە هەڵە دادەنێن و لەجێی ئەوە ناوی "کوردیی ناوەندی/ناوەڕاست یا کوردیی خواروو" بە ڕاست دەزانن. ئێستا ئیدی ئەوەیش شاراوە نییە کە ناوهێنانی ئەو

زمانە ئەدەبییە وەک "سۆرانی" مەبەستێکی نازانستی و تەکتیکیی لە پشتەوەیە بۆ بچووک پیشاندان و داشکاندنی نرخی ئەدەبی و فەرهەنگیی زمانە ئەدەبییەکە.

کاتێ نووسەر و ڕووناکبیری کورد ئەو شێوەزمانە بە باشترین و گونجاوترین شێوە دادەنێن بۆ ئەوەی بکرێتە زمانی ڕەسمیی کوردستان، دیارە کۆمەڵێ بەڵگەی مێژوویی و زانستی دەهێننەوە بۆ پشتگریی هەڵوێستەکەیان. ئێمە دەتوانین ئەو بەڵگانەی لای زۆربەی نووسەران دووبارە دەبنەوە بەم جۆرە کورت بکەینەوە:
١. کوردیی خواروو دەوڵەمەندترین شێوەزمانی کوردییە، چونکە هەم لە قۆناغی کلاسیکدا و هەمیش لە قۆناغی تازەدا ئەدەبییاتێکی فراوان و دەوڵەمەندی پێ نووسراوە و کۆمەڵێک لە نووسەر و شاعیرە هەرە گەورەکانی کوردستان بەم شێوەیە بەرهەمەکانی خۆیان نووسیون.
٢. بە پێچەوانەی دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردییەوە کە هەر یەکێکیان لە سەردەمێکدا زمانێکی ئەدەبیی ناوچەیەکی کوردستان بووە و دواتر بە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەو دەستەڵاتە سیاسییەوە کە بووبووە پاڵپشتی، ئەوانیش ڕۆڵی خۆیان لە دەست داوە، کوردیی ناوەڕاست هەر لە سەرەتای دامەزرانییەوە وەک زمانێکی ئەدەبی و تا ئەمڕۆیش، بێ ناوبڕ، ئەو نەخشەی هەبووە. ئەمە وا دەکات کە ببێتە تاکە شێوەیەک کە مێژوویەکی بێ ڕاوەستان و بێ ناوبڕێ لە پشتەوەیە.
٣. کوردیی ناوەڕاست یا خواروو لە سەردەمی پاشایەتیی شێخ مەحموودی حەفیددا زمانی ڕەسمیی حوکوومەتی کوردستان بووە، هەروەهایش لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا بە سەرکردایەتیی قازی محەمەد دیسان زمانی ڕەسمیی کۆماری کوردستان بووە. لە سەردەمی دەستەڵاتی شۆڕشی ئەیلوولدا (١٩٦١-١٩٧٥) بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفای بارزانی و لە سەردەمی شۆڕشی تازەیشدا دیسان هەر کوردیی خواروو زمانی ڕەسمیی دەستگاکانی شۆڕش بووە لە سەرتاسەری کوردستانی عیراقدا، چ ئەو کاتانەی

خەباتی چەکدارانە کراوە و چ ئەو ساڵانەیش کە سەرکردایەتیی سیاسیی بزووتنەوەکە دەستەڵاتی سیاسی و کارگێڕیی بە دەست بووە. ئێستایش لە ساڵی ١٩٩٢ەوە کە هەرێمی کوردستان عیراق بە شێوەیەکی ڕەسمی حوکوومەتی فیدەراڵییە، دیسان هەر ئەو شێوەزمانە زمانی ڕەسمیی حوکوومەت و سیاسەتمەدار و سەرکردەکانی کوردستانە، هەر بەو هۆیەیشەوە لە بواری سیستەمی کارگێڕی و ڕۆژنامەگەری و دیپلۆماسی و سیاسیدا بە شێوەیەکی فراوان گەشەی کردووە و لە ڕووی زاراوەسازییەوە دەوڵەمەندتر بووە.

٤. کوردیی خواروو لە ماوەی ٩٠ ساڵی ڕابوردوودا زمانی ڕەسمیی خوێندن و پەروەردە بووە لە خوێندنگەکانی کوردستانی عیراقدا، لە پلە جیاوازەکانی خوێندندا، لە سەرەتاییەوە تادەگاتە زانستگە، سا ئیتر ئەو سیستەمی پەروەردەیە لە ناوچەیەکی سنووورداردا بووبێت یا سەرتاسەری کوردستانی عیراقی داپۆشیبێت. ئێستایش سیستەمی خوێندن و پەروەردە نزیکەی سەرتاسەری کوردستانی گرتووەتەوە و هەر بەو شێوەزمانەیش داڕێژراوە.

٥. لە بواری ڕۆژنامەگەری و کتێب و وەرگێڕاندا، کوردیی خواروو تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر پێش کەوتووە و شاکاری زۆر گەورە و گرنگی پێ نووسراوە و زۆر لە شاکارە ئەدەبی و زانستییەکانیش تەرجەمەی ئەم شێوەزمانە کراوە.

ئەگەرچی کوردیی خواروو ئێستایش نەخشی زمانێکی ڕەسمی و ستاندارد دەبینێت، بەڵام دەکرێ بەوە دەوڵەمەندتر بکرێت کە وشە و زاراوە و دەربڕین لە دیالێکتەکانی دیکەی زمانی کوردییەوە وەربگرێت، بەتایبەتی ئەوانەیان کە پاشخانێکی ئەدەبی و فەرهەنگییان هەیە، وەک کوردی (کرمانجی)ی سەروو و هەورامی.

# یەکەم: ڕێنووس و ئەلفوبێ

## ئەلف: ڕێنووس یا ڕاستنووسی (Orthography)

### پاشخانێکی مێژوویی، بە کورتی

کێشەی ڕێنووس لە زمانی کوردیدا یەکێکە لەو کێشانەی کە هەر لە زۆر زووەوە زمانزانانی کورد هەستیان پێ کردووە و هەوڵیان داوە چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، بەو ئامانجەی کە بتوانرێ وشەی کوردی بە شێوەیەکی ڕاستی وا بنووسرێت کە لەگەڵ شێوەی گۆکردنی وشەکاندا و لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا بگونجێت. دیارە کێشەی ڕێنووس تەنیا پێبەستی دەنگ (لێرەدا مەبەستم فۆنەتیکە) نییە، بەڵکە پێوەندییەکی زۆریشی بە ڕێزمانەوە، بە مۆرفێمی وشەکانەوە و بە سینتاکسیشەوە، هەیە.

چارەسەری کێشەکانی ڕێنووسی کوردی بە کۆمەڵێ قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە و کارێکی یەکدەست و یەکگرتوویش نەبووە، چونکە نە دەستگایەکی سیاسی و کارگێڕی و نە دەسگایەکی فەرهەنگیی ناوەندی نەبووە تا ئەم هەوڵدان و چارەسەرانە یەک بخات. وا پێ دەچێت زمانزانانی کورد، یا ئەو کەسانەی سەروکاریان لەگەڵ نووسینی کوردیدا هەبووە، لە پێشدا چارەسەریان بۆ کۆنسونانتەکان دۆزیوەتەوە و دواتریش بزوێنەکان (ڤاوڵ یا ڤۆکال). من چاپی یەکەمی فەرهەنگەکەی شێخ یووسوف زیائوددین پاشای خالیدیی مەقدسی(١٨٤٢-١٩٠٦)م لایە کە ساڵی ١٨٩٤ چاپ کراوە. لەوێدا نووسەر بۆ دەنگەکانی (پ، چ، گ، ژ) تیپ یا نیشانەی تایبەتی داناوە. ڕەنگە ئەمانە زۆر گرنگ نەبن چونکە پێشتر لای فارس ئەم تیپانە هەبوون و کوردیش چاوی لەوان کردووە، بەڵام سێ نیشانە لەو فەرهەنگەدا بە لای منەوە یەکجار گرنگن؛ دەنگەکانی (ڤ) و (ۆ) و (ێ) کە نیشانەی تایبەتی خۆیان هەیە. ئێمە دەزانین دەنگی (ڤ) لە زمانی فارسییشدا هەیە، بەڵام ئەوان هەر بە (و) دەینووسن چونکە بە هۆی بە دوای یەکداهاتنی بزوێن و نابزوێنەکانەوە دەکرێ بێهەڵە

بخوێنرێتەوە. گرنگیی کارەکەی یووسوف پاشا ئەوەیە کە بۆ ئەوەی ئەرکێکی زۆر نەخاتە سەر تیپی (و) هاتووە تیپی (ڤ)ی بۆ دەربڕینی ئەو دەنگە بە کار بردووە. پێم وایە ئەوە یەکەمین چاپەمەنیی کوردییە کە تیپی (ڤ)ی تێدا بە کار برابێت. یووسوف پاشا بیری لەوەیش کردووەتەوە کە بزوێنەکانی (ۆ) و (ێ) دەبێ نیشانەی تایبەتی خۆیان هەبێت، هاتووە ئەو دوو تیپەی بەو شێوەیە نووسیوە کە لەجێی ئەو کڵاوەی، یا ئەو (حەوت)ەی، ئێمە ئەمڕۆ لەسەر ئەو دوو تیپەی دادەنێین، ئەو (هەشت)ێکی لە ژێریاندا داناوە.[17]

نموونەیەکی دیکە ئینجیل (بایبڵ)ی مارقۆسە کە تەرجەمە کوردییەکەی ساڵی ١٩٠٩ چاپ کراوە و لەوێدا وەرگێڕ تیپی (ڵ)ی بە کار بردووە. لەبەر ئەوەی ئەو بەشەی ئینجیل کراوە بە کوردیی موکریانی و لەو دیالێکتەیشدا، وەک دەزانین، بە (خودا) دەگوترێ (خوڵا)، کابرا هاتووە (حەوت)ێکی چکۆلەی لەسەر تیپی لام (ل)ەکە داناوە و کردوویەتی بە نیشانە یا نوێنەری فۆنیمی (ڵ). پێم وایە ئەوەیش یەکەم جارە لە چاپکراوێکی کوردیدا تیپی یا نیشانەی (ڵ) بە کار هاتبێت.[18]

ئەمەی لێرەدا باسم کردووە زیاتر پێوەندیی بە فۆنێمەکان و ئەو نیشانانەوە هەیە کە بۆ نوێنەرایەتیکردنیان لە ڕێنووسی کوردیدا دانراون.[19] بەشێکی دیکەی گرنگی ڕێنووس پێوەندیی بە مۆرفێم و سینتاکسەوە هەیە. ڕاستییەکەی ئەوەیە ڕێنووس یا ڕاستنووسی تا ڕادەیەکی زۆر بەستراوە بە زانین و تێگەیشتنی ڕێزمانەوە. ئەو کەسانەی کە لە نووسیندا هەڵە دەکەن و ڕاست نانووسن و تەنانەت دوای ڕەخنەگرتنیش لێیان هەر لەسەر هەڵەکانیان دەڕۆن و ناتوانن چارەی بکەن، لەبەر ئەوەیە کە شارەزای ڕێزمانی کوردی نین.

---

[17] الخالدي المقدسي، الشيخ يوسف ضياءالدين پاشا: الهدية الحميدية في اللغة الكردية، سعادت مطبعەسی، ١٣١٠ [١٣١١ هـ، ١٨٩٤ م].

[18] انجيل مرقوس، Markus-Evangelium (Mukri Kurdisch), Druckerei Awetaranian philippopel, 1909.

[19] بە زمانی ئینگلیزی بەم نیشانانە دەگوترێ (Diacritical marks/signs)، بە کوردییش جاران دەگوترا "سەروبۆر".

ڕەنگە ئێمە بەتەواوی ئاگاداری ئەو هەوڵدان و ڕیفۆرمانە نەبین کە بە درێژایی مێژووی بە کوردی نووسین کاریان بۆ کرابێت. هەندێ لەو بنەما و نیشانانە لە ڕێگەی دەستنووسە کۆنەکانەوە بە ئێمە گەیشتوون و بە هۆی ئەوانەوە تێگەیشتووین کە کەسانێک هەبوونە بیریان لەوە کردووەتەوە کوردی دەبێ چۆن بنووسرێت. دوای بڵاوبوونەوەی کتێب و ڕۆژنامە بە زمانی کوردی ئیتر وێنەیەکی ڕوونتری ئەو پرۆسێسی ڕیفۆرمکارییەمان بۆ ماوەتەوە؛ وێنەیەکی چاپکراو، کە دەگاتە دەست خەڵکێکی زۆرتر. دواتریش کاتێ لە کوردستانی باشوور زمانی کوردی پلە و ستاتووسی زمانێکی نیوچەڕەسمی یا ڕەسمیی وەرگرتووە و کۆمەڵێ گۆڤار و ڕۆژنامەی پێشەنگ بڵاو کراونەتەوە، هەوڵدانەکان چوونەتە چوارچێوەیەکی ڕەسمی و فراوانترەوە و بنەماکانی ڕێنووس بە شێوەیەکی ڕوونتر ڕۆ نراون، تا دەگاتە سالانی دامەزرانی کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا و چەند دەستگایەکی دیکەی زانستی و فەرهەنگی. لە ئەنجامی ئەو چاکسازی و ڕیفۆرمانەدا ڕێنووسی کوردی لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا تا ڕادەیەکی باش ڕێک خرا و جێی خۆی گرت و تا سالانێکیش دواتر لەناو بەشی هەرە زۆری خوێنەوار و نووسەر و ڕووناکبیرانی کوردستاندا پێڕۆیی دەکرا.[20]

لە سەرەتای نەوەدەکانەوە فەرهەنگی کورد و زمانی کوردی و وشەی کوردی پێی نایە سەردەمێکی تازەوە کە لە هەموو ڕوویەکەوە لە ڕابوردووی هەزارساڵەی جیاوازە. لەم سەردەمە تازەیەدا بووین بە ئاشنای ئازادی، بووین بە دۆستی سەربەخۆیی و بووین بە خاوەنی نیشتمانێک، بەڵام زمانەکەمان، زمانی کوردیمان، دۆڕاند و فەرهەنگی کوردمان دزێو کرد و وشەی کوردیمان لە دەست دەرچوو. ئێمە ئەگەر لە تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکانی ئەم سەردەمە ورد ببینەوە دەتوانین بە درێژی قسەیان لەسەر بکەین و بەپێی ژمارە و ئامار زۆر

---

[20] دۆکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف (١٩٤٠-٢٠٠٧) لەم بوارەدا کۆمەڵێ وتار و لێکۆڵینەوەی باشی بڵاو کردوونەوە. بۆ نموونە بڕوانە: حاجی مارف، ئەوڕەحمان (دۆکتۆر): ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی، بەغدا ١٩٨٦.

شت بڵێین و لێکۆڵینەوە پێشکەش بکەین. ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینین ئەمە سەردەمی ڕووخانی فەرهەنگی کورد و هەڵوەشانەوەی زمانی کوردییە. دەکرێ لەم ڕووەیشەوە بە شێوەی جیاواز دیاردەکان بخوێنینەوە و ئەنجامگریی جۆراوجۆریان لێ هەڵێنجێنین. من ئێستا، لەم نووسینەدا، ئەو هەموو لایەن و دیاردە ناتەندروستانە ناکەمە بابەتی لێکۆڵینەوە و بەراوردکردن، بەڵکە دەمەوێ لە پلەی یەکەمدا باسی ڕێنووس بکەم.

من نازانم لە کوردستانی ئەمڕۆدا ژمارەی گۆڤار و ڕۆژنامە و حەفتەنامە و مانگنامە و وەرزنامەکان چەندە، بەڵام ئەگەر لە بیرم مابێت، لە جێگەیەکدا خوێندمەوە، لە سێسەد بەرەو ژووورە.[21] من نازانم ساڵانە چەند کتێب چاپ دەکرێت، بەڵام بەپێی ژمارەی پەخشخانە و نووسەران و دەنگوباسی ناو ڕۆژنامەکان بێت، دەبێ لە دووهەزار کەمتر نەبێت. لەمانەیش بترازێ ژمارەی ئەو کتێبانەی ساڵانە لە خوێندنگەکاندا، لە سەرەتاییەوە بگرە تا دواناوەندی، و لە زانستگە و پەیمانگەکاندا دەخوێنرێن ناکرێ لە دوومیلیۆن کەمتر بێت. ئێستا ئەم هەموو کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار و چاپەمەنییە بهێنە پێش چاوی خۆت، ئەوجا بزانە چۆن زمانێکی لاواز و نەخۆش، فەرهەنگێکی سادە و ڕووتوڕەجاڵ و ڕێنووسێکی خوار و گێڕ، وەک چۆن ئاگر بەر دەبێتە پووش و پەڵاش، ئاوەها بەربوونەتە ئاوەز و هۆش و بیرەوەری و وزەی داهێنانی مرۆڤی کورد، لە خوێندکارێکی پێنج شەش ساڵانەوە بگرە تا دەگاتە نووسەرێکی حەفتا ساڵان. ئەمە کارەساتێکی نەتەوایەتییە، ئەمە تاعوونێکی فەرهەنگییە و پەتایەکی زمانەوانییە. ئەگەر جاران هەموو دواکەوتنی زمان و هەژاریی فەرهەنگیی خۆمان دەکردە تاوانی دوژمنان و داگیرکاران، ئەمڕۆ هەموو پاساودانێکی ئەم لێقەومانە بیانووهێنانەوەیەکی درۆزنانە و

---

[21] لەم ڕووەوە ئامار و ژمارەی تەواومان لە بەردەستدا نین. هەر دوای نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە سەرچاوەیەکی دیکەدا ئەوەم بەرچاو کەوت کە ژمارەی ڕۆژنامە و گۆڤار و مانگنامە و وەرزنامەکانی کوردستان لە شەشسەد زیاترن، سەرچاوەیەکی دیکەیش ژمارەی هەشتسەدی دابوو.

هەڵخەڵەتێن و فریودەرانەیە. من گەلێ جار و لە زۆر دەرفەتدا وتوومە و ئێستایش دەیڵێمەوە، بێ ئەوەی ناهەقییەکم کردبێت، ئەمڕۆ لە کوردستاندا یەک تاکە کتێب، یەک تاکە گۆڤار، یەک تاکە ڕۆژنامە و حەفتەنامە و مانگنامە و وەرزنامە نییە کە بە کوردییەکی ڕاست و بە ڕێنووسێکی ڕاست نووسرابێت."[22]

من خۆم کە لە ماوەی یانزدە ساڵدا گۆڤاری "مامۆستای کورد"م بڵاو کردەوە، لە سەرەتاوە نا، بەڵام هەر نەبێ لە ناوەڕاستی ئەو ماوەیەدا لەبارەی ڕێنووسەوە کۆمەڵێ ئەنجامگریم لا گەڵاڵە بووبوون کە لە ڕووی زانستییەوە دەمتوانی بەرگرییان لێ بکەم و بە نووسەرێکی کورد، کە بەرهەمێکی دەنارد لە گۆڤارەکەدا بڵاو بکرێتەوە، بڵێم من ڕێنووسەکە دەستکاری دەکەم و لەگەڵ ڕێنووسی گۆڤارەکەدا دەیگونجێنم. ئێستا ئەگەر تەماشایەکی ژمارەکانی مامۆستای کورد بکەیت، دەبینیت بەرهەم و نامەی زانا و نووسەرانی گەورە و ناوداری وەک مەسعوود محەمەد، کەمال مەزهەر ئەحمەد، مارف خەزنەدار، محەمەدی مەلا کەریم، سەیید محەمەدتاهیری هاشمی، شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت و زۆری دیکەیان تێدا بڵاو کراوەتەوە.

کە نووسەرێکی ئەزمووندار و شارەزا و زمانزان بیەوێ دەست بەو بنەمایانەی ڕێنووسەوە بگرێت، کە لە ئەنجامی ساڵانێکی دووردرێژی نووسین و لێکۆڵینەوەدا پێیان گەیشتووە، من ڕێزی ئەو ویستەی دەگرم، بەڵام پێیشم خۆشە گوتوبێژێکی زانستیی لەگەڵدا بکەم، بۆ ئەوەی تێبگەم لەو ڕووەوە چۆن بیر دەکاتەوە و بە چ شێوەیەک بەرگری لەو بنەمایانە دەکات. ئێستە بووە بە نەریتێک کە تەنانەت کۆلکەخوێنەوار وزڕەنووسەرەکانیش خەوش و نەزانیی خۆیان بەوە دەشارنەوە کە گوایە ئەوانیش بیری تایبەتی خۆیان لەبارەی زمانەوە هەیە و ڕێنووسی تایبەتی خۆیان پێڕۆیی دەکەن و دەبێ ڕۆژنامەکان ڕێزی ڕێنووسەکانیان بگرن و دەستکاریی نەکەن. ئەم دەردەیش بەشێکە لەو ئاژاوەیەی دەستگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی دروستیان کردووە. لە

---

[22] شاکەلی، فەرهاد: زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا، پرۆژەی تیشک، ٢٠٠٨، ل: ٢٣٠-٢٣٣.

کوردستاندا ئێستاکە زیاتر لە ٣٠٠ ڕۆژنامە و گۆڤار و مانگنامە وەرزنامە بڵاو دەکرێتەوە، بەڵام بە هەموویانەوە دوو کەسی زمانەوان یا زمانزانیان نییە زمانی ئەو هەزاران وتار و ڕیپۆرتاژ و شیعر و چیرۆک و لێکۆڵینەوانەیان بۆ بکاتە کوردی و ڕێنووسەکەیان بە جۆرێک بۆ ڕاست بکاتەوە کە نەکرێ ڕەخنەی لێ بگیرێت.
قەیرانی ڕێنووس و ئەو سەدان و هەزاران هەڵەیەی لە تێکستێکی ئاساییدا بەرچاو دەکەون هەستێکی وا لای من، وەک خوێنەرێک و کوردیزانێک، دروست دەکات وەک بڵێی نووسەرەکان دەیانەوێ پلەی وریایی و ژیریی خوێنەر تاقی بکەنەوە و ناچاری بکەن خۆی لوغزی وشە هەڵەکان هەڵبێنێت، یا ناچاری ئەوەی بکەن پەنا بباتە بەر هێزێکی نەپەنی (هێزێکی غەیبی) تا بێت بە هانایانەوە و دەستیان بگرێت و وشە ڕاستەکان بە پەرجوو (موعجیزە)یەک بخاتە مێشک و دڵ و دەروونیانەوە. دیارە منیش دەزانم و خۆیشیان، نووسەرانی هەڵەنووس، دەزانن کە مەسەلەکە ئەوە نییە. بەڵام ئەوەی کە ئەوان نایزانن و ناشیانەوێ پێ لە نەزانینەکەی بنێن، ئەوەیە کە ئەوان شارەزای ڕێزمان و ڕێنووسی کوردی نین و ئەو کوردییەی دەینووسن کوردییەکی ڕاست نییە و کوردییەکی هەڵەیە.

## بێ: ئەلفوبێ

بابەتی ئەلفوبێ و پەیدابوونی هەندێ هەوڵدان و بیرکردنەوە بۆ گۆڕینی ئەلفوبێی کوردی بۆ ئەلفوبێی لاتینی/ تورکی بەشێکی زۆر فراوان و گەورەی ئەو نووسین و هاوپرسەکی و باسانەی داگیر کردووە، کە ئەمڕۆ لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستان و سایتەکانی ئینتەرنێت بڵاو دەبنەوە. لەم بوارەیشدا، لەگەڵ هەبوونی باوەڕی جیاوازدا، دیسانیش لای بەشێکی ڕووناکبیران، ئەوانەی زیاتر شارەزای زمانەوانی و زمانی کوردین، یەکدەنگییەکی ئاشکرا و بەهێز بە دی دەکەین، ئەگەرچی هەڵوێستەکان و نزیکبوونەوەکان لە پلەی جیاوازدان. هەروەها نوختەکانی دەرچوونیش لەگەڵ یەکدی جیاوازییان هەیە. لە کاتێکدا هەندێ لە بەڵگە و گۆشەنیگاکان پێوەری

تیۆریی زمانەوانی و زانستین، هەندێکی دی بەڵگەی سیاسی و مێژوویی و فەرهەنگین. دیارە لای بەشێکیش هەردوو شێوەکانی بەڵگەهێنانەوە دەکرێنە بناغەی بنیاتنانی بیروڕاکانیان. بەڵگە زمانەوانی و زانستییەکان پێمان دەڵێن کە ئەلفوبێی لاتینی لە ڕووی نرخی فۆنەتیکییەوە ناتوانێت کۆمەڵێ لەو دەنگانە، لەو فۆنێمانە، دەرببڕێت کە لە زمانی کوردیدا هەن و نەبوونیان کەلێنێکی گەورە و مەترسیدار دروست دەکات. ئەمە بێجگە لەوەی زمانی ئەمڕۆ تێک دەدات و سیستەمی دەنگ دەشێوێنێت [کە هەر لە ئێستاوە لە شێوەی قسەکردنی کوردی تورکیادا بە ئاشکرا هەستی پێ دەکرێت]، دەبێتە ڕێگرێکی تەواویش لە بەردەم گواستنەوەی هەموو ڕابوردووی ئەدەبی و فەرهەنگی و شارستانەتیمان، ئەگەر بمانەوێ ئەو ڕابوردووە بگوێزینەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو، چونکە تۆ ناتوانیت ئەو تێکستە کوردییانەی بە ئەلفوبێی کوردی نوسراون، بخەیتە سەر ئەلفوبێی لاتینی، کاتێ ئەو ئەلفوبێیە نیشانەی بۆ ژمارەیەکی زۆری دەنگەکان دانەنابێت. ئەگەر بیر لە تێکستە کلاسیکییەکان بکەینەوە مەسەلەکە زۆر ئاڵۆزتریش دەبێت، چونکە زمانی کلاسیکی کوردی ئاوێتەیەکی تەواوە لە وشەی کوردی و عەرەبی و فارسی، کە ئەمڕۆ بە هۆی لەیەکچوونی ئەلفوبێوە ئێمە ئەو وشانە و ئەو دەنگانەی بەتایبەت سەر بە زمانی عەرەبی یا فارسین، دەناسینەوە و دەخوێنینەوە. بەڵام تۆ ناتوانیت ئەو تێکستە کلاسیکییانە بخەیتە سەر ئەلفوبێیەک کە تەنانەت دەنگەکانی زمانی کوردی خۆیشی تیدا نییە، چ جای دەنگەکانی زمانی عەرەبی و فارسی.

ئەلفوبێی کوردی بووەتە بەشێک لە فەرهەنگی نەتەوەی کورد و هەموو جوانی و نرخە ئێستێتیکییەکانی زمانی کوردیی دە خۆیدا جێ کردوونەتەوە و پاراستوونی، لەبەر ئەوە وازلێهێنانی واتە وازهێنان لە بەشێکی هەرە گرنگ و زیندووی شارستانەتی و فەرهەنگی کورد. ئێمە دەزانین بیری بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی لە ناوچەی ئێمەدا لە مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە دەستی پێ کردووە. ئەتاتورک خاوەنی ئیدیۆلۆگییەکی دژ بە ڕۆژهەڵات و عەرەب و ئیسلام بوو، خاوەنی

ئیدیۆلۆگییەکی ڕەگەزپەرستانە بوو، دەیویست بە زۆری زۆردارەکی نەتەوەی تورک لەو ژینگە ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامییەی خۆی داببڕێت و بیکاتە ئەوروپایی. ئەو پێی وا بوو هەرچی دواکەوتنی تورک و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانییە تاوانی فەرهەنگ و شارستانەتیی ڕۆژهەڵات و ئیسلامە و دەتوانێ بە سەپاندنی ئەلفوبێ و شێوەی جلوبەرگ و یەکەکانی کێشان و سیستەمی ناسناو و هەندێ گۆڕینی ڕووالەتیی وەها، تورک بکاتە گەلێکی ئەوروپایی و تورکیایش بکاتە بەشێک لە ئەوروپا. ئەنجامەکەی ئەو دیاردە سەیر و سەمەرەیەی تورکیای ئەمڕۆی لێ دەرچوو، کە بەشێکی زۆری ڕابوردووی شارستانەتی و فەرهەنگیی خۆی دۆڕاند، بەڵام نەبوو بە ئەوروپاییش.

بە جیا لەو بۆچوونانەی ئێستا باسم کردن، لای من پرسیارێکی هەرە ڕەوا و مەنتیقی ئەوەیە کە بۆچی دەبێ ئێمە بیر لە گۆڕینی ئەلفوبێ بکەینەوە؟ بۆچی دەبێ واز لە ئەلفوبێیەک بهێنین کە نزیکەی هەزار ساڵە بە کاری دەبەین و ئەلفوبێیەک بخەینە جێگەکەی کە نە هیی ئێمەیە و نە دەتوانێ ببێتە هیی ئێمە. ئەگەر مەسەلە گونجان و چاکی بێت، هیچ ئەلفوبێیەک لە هیچ ئەلفوبێیەکی دیکە چاکتر یا خراپتر نییە. ئەلفوبێ مەسەلەیەکی پێکهاتنە (Conventional) و چاکی و خراپییەکەی بەوە دەپێورێت تا چ ڕادەیەک دەتوانێت دەنگەکانی زمانەکە بنوێنێت و بگەیێنێت. ئێستا کە بەراوردی ئەلفوبێی کوردی لەگەڵ ئەلفوبێی لاتینی تورکی دەکەین، دەبینین ئەلفوبێی کوردی هەموو دەنگەکانی زمانی کوردیی دە خۆیدا هەڵگرتووە، بەڵام ئەلفوبێی لاتینی تورکی بە لای کەمەوە هەشت دەنگی زمانی کوردیی کوشتووە و هیچ نیشانەیەکی بۆ دانەناون. ئەگەر ئەلفوبێی کوردی یەک یا دوو کێشەی بچووکیشی تێدا هەبێ، ڕێگای ڕاست ئەوەیە ئەو ناتەواوییانە چارەسەر بکرێن نەک واز لە ئەلفوبێیەکە خۆی بهێنین بۆ ئەلفوبێیەکی دیکە کە پڕە لە ناتەواوی. لەوەیش گرنگتر ئەو ڕاستییەیە کە ئێمەی کورد بە هۆی ئەلفوبێی کوردییەوە، بە هۆی ئایینەوە، بە هۆی فەرهەنگەوە، بە هۆی جیۆگرافیا و مێژووەوە بەشێکین لە شارستانەتییەکانی ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامی و

ئێرانی و بە هیچ شێوەیەک ناتوانین و نابێت دەستبەرداری ئەو پێوەندییە ژیاری و شارستانەتییە ببین.
ئەو بیانووانەی هەندێ لە لایەنگرانی ئەلفوبێی لاتینی تورکی دەیهێننەوە کە گوایە بە هۆی ئەو ئەلفوبێیەوە ئێمە زووتر لە ئەورووپا و دنیای پێشکەوتوو نزیک دەبینەوە و باشتر دەستمان دەگاتە تەکنیکی تازە و زمانەکەمان بۆ فێربوون هاسانتر دەبێت و گەلێ شتی دیکەی وەها ڕووالەتی، هەر هەموویان هێندە ساویلکانە و گەوجانەن کە تەنیا کەسانێکی مێشکشۆراوە دەتوانن وا بیر بکەنەوە و بەڕاستی بۆ ئەوە نابێت مرۆڤ خۆیان پێوە خەریک بکات. من لە چەند نووسین و دیداری دیکەمدا لەم ڕووەوە بەدرێژا قسەم کردووە و هەندێ لە شارەزایانی زمانی کوردی، لە دەرفەتی جیاوازدا بە درێژا وەرامی ئەو هیپۆتێزانەیان داوەتەوە. نەتەوەکانی وەک چین و جاپان و عەرەب و فارس و کۆریا و جوولەکە و تایلاند و ئەرمەن لەو نەتەوانەن کە ئەلفوبێی خۆیان پاراستووە و لاتینی بە کار ناهێنن، بەڵام نەتەوەی سۆمالیا زمانی خۆیان بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسن.
بە خوێندنەوەی هەڵوێست و بۆچوونی هەندێ لەو کەسانەی لەبارەی کێشەی ئەلفوبێوە دەنوسن و لە باس و موناقەشەکاندا بەشداری دەکەن، هەست دەکەم ناڕوونییەک و حاڵینەبوونێک لەو ڕووەوە لە ئارادایە کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە و باسکردنی زیاتر هەیە. ناڕوونییەکە، پێم وایە، لەم دوو ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێت:
١. ئەو زانیارییانەی لەبارەی قەوارە و ڕێژەی بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینییەوە هەیانە چەوتن و لەگەڵ ڕاستییەکانی هەلومەرجی واقیعیدا یەک ناگرنەوە.
٢. وێنەیەکی هەڵە و ناتەواو و شێواویان لەبارەی بار و هەلومەرجی فەرهەنگی و خوێندەواریی کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستانەوە هەیە، بەتایبەت کوردستانەکانی تورکیا و سووریا و سۆڤیێتی جاران.
من ئەوە تێدەگەم کە لەبەر نەبوونی پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ و گەرموگوڕ لەناو نووسەران و ڕووناکبیرانی بەشەکانی کوردستاندا، لەوەیە وێنەیەکی ڕاست و تەواو لەسەر باری فەرهەنگیی ئەو بەشانە

له بەردەستدا نەبێت. ئەمەیش، لە پاڵ کۆمەڵێ هۆی سیاسیدا، دیارە، بەرهەمێکی پەیدابوونی ئەلفوبێی لاتینییە، ئەگەرنا ئێمە دەزانین هەتا ساڵی ١٩٢٥یش، کە پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عیراق، ڕووناکبیرانی هەموو پارچەکانی کوردستان، بەتایبەت ڕووناکبیرانی کوردستانی عیراق و تورکیا، پێکەوە کاریان کردووە و ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی تا ئەو کاتە بە کوردی بڵاو کراونەوە بەرهەمی پێنووس و بیر و هۆشیاریی هەموویانە.[٢٣] کەچی ڕووناکبیرێکی ئەمڕۆی کوردستانی تورکیا، ناتوانێت یەک لاپەڕە، یەک ڕستە، یەک وشە و یەک حەرفیش لەو میلیۆنان لاپەڕانەی لە کوردستانی عیراق چاپ دەبن، بخوێنێتەوە (ئەمە ئەگەر بەگشتی قسە بکەین، دەنا من لەناو نووسەر و خوێنەوارانی کوردستانی تورکیادا سێ چوار کەسێک دەناسم کە دەتوانن کوردیی خواروو بخوێننەوە). هۆی ئەم نەزانین و نائاشنایەتییە لەگەڵ کوردیی خوارووودا ئەو زیندانە مۆدێرن و تازەیەیە کە بۆ خۆیانیان دروست کردووە و ناویان ناوە ئەلفوبێی لاتینی. زۆر سەیرە مرۆڤ بە دەستی خۆی، بە هۆی ٣٣ یا ٣٤ حەرفەوە، خۆی لە هەموو ڕابوردووی خۆی و لە بەشی هەرە زۆری فەرهەنگ و ئەدەبیاتی ئەمڕۆی نەتەوەکەی خۆی بێبەش بکات و دڵیشی بەوە خۆش بێت کە بووەتە خاوەنی ئەلفوبێیەکی مۆدێرن، کە ئەوەیش خۆی هەڵینەبژاردووە، بەڵکە دوژمنە خوێنڕێژ و داگیرکارەکەی بەسەریدا سەپاندووە.

ئێمە ئەگەر وای دابنێین کە ڕاستە دەوڵەتی تورکیا ڕێگەی لە بەکارهێنانی زمان و فەرهەنگی کورد گرتووە (کە ئەمە بە لای کەمەوە لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردووەوە ڕاست نییە)، بەڵام چی و کێ ڕێگەی لە سەدان هەزار یا میلیۆنان خوێنەواری کوردی تورکیا گرتووە ئەو هەزاران کتێبە و ئەو سەدان هەزار لاپەڕەیەی ڕۆژنامە و

---

[23] پیرەمێرد لە مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥دا گەیشووەتەوە کوردستان. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە لە تورکیای عوسمانی ژیاوە، لە زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا بەشدارییەکی چالاکانەی کردووە.

گۆڤار و ئینتەرنێتە کوردییەکانی کە لە کوردستانی عیراق بەرهەم دەهێنرێن، بخوێننەوە و سوودیان لێ وەربگرن؟ ئایا کە سوودیان لێ وەرناگرن لەبەر ئەوەیە کە بە "سۆرانی" نووسراون و ئەوان لێیان ناگەن؟ باشە، خۆ لە دهۆک هەزاران کتێب و چەندان ڕۆژنامە و گۆڤار بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو (شێوەی بادینان) بڵاو دەبنەوە، ئەی بۆ ئەوانە ناخوێننەوە و سوودیان لێ نابینن؟ دیارە دیسان ئەو ٣٢ حەرفەیە بووەتە تەوقی لەعنەت و ڕێی لێ گرتوون، ئەگەرنا ئێمە دەبینین خوێنەرانی کوردستانی ئێران بە درێژاییی مێژوو، نە ڕێژیمی شا و نە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی نەیتوانیوە سنووریان لێ دابخات، تا نەهێڵێت سوود لە چاپەمەنییەکانی کوردستانی عیراق وەربگرن. تەنانەت لە ڕەشترین سەردەمەکانی ڕێژیمی شادا، سەدان کتێب و ڕۆژنامە لە کوردستانی عیراقەوە دەگەیشتنە دەستی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کوردستانی ئێران. هەر لەو سەردەمەدا بوو کە ئینتیشاراتی "سەیدیان" لە سابڵاخ دەیان کتێبی بە نهێنی و بە نیوچەئاشکرا سەرلەنوێ چاپ دەکردەوە و بەناو خوێنەرانی ئەو بەشەی کوردستاندا بڵاوی دەکردنەوە. ئەنجامەکەیش ئەوەیە کە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە ڕابوردووی خۆی دانەبڕاوە و سوودیش لە ئەدەب و فەرهەنگی کورد وەردەگرێت. ئەمڕۆ ئەگەر لە ئێراندا زمانی کوردی هەر بە تەواوی قەدەغە بکرێت و ڕێگە بە بڵاوبوونەوەی یەک وشەی کوردییش نەدرێت و یەک لاپەڕەیش بە کوردی چاپ نەکرێت، دیسانیش خوێنەرانی کوردستانی ئێران پەکیان ناکەوێت، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ڕاستییەوە ئەمڕۆ ئەگەر سنوورە ڕەسمییەکانی نێوان کوردستانی عیراق و کوردستانی تورکیا هەڵبوەشێنرێنەوە و ئەو دوو پارچەیەی کوردستان یەک بگرنەوە، دیسان خوێنەرانی کوردستانی تورکیا هیچ سوودێک لە میلیۆنان لاپەڕەی کتێب و ڕۆژنامە و چاپەمەنیی کوردستانی عیراق وەرناگرن. تۆ بڵێی لە هەموو مێژوودا بتوانین نموونەی گەلێکی دیکەی وەها بدۆزینەوە کە بەو شێوەیە مێشکی شۆردرابێتەوە و فەرهەنگ و ناسنامە و شارستانەتیی خۆی پێ نامۆ بێت؟

وا پێ دەچێت بە هۆی ئەو ناڕوونی و نەبوونی زانیاریی دروستەوە هەندێ لەوانەی لە باسەکاندا بەشداری دەکەن، بە جۆرێک سادەیی و ئاسانگرییەوە باسی ئەلفوبێی لاتینی دەکەن. من پێم وایە ئەمە لەو بابەتانەیە کە بە هیچ جۆرێک ناکرێ سازشی لەسەر بکرێت یا بە ئاسانی وەربگیرێت. هەموو خەمساردییەک لەم ڕووەوە ئەوە پێشان دەدات کە ئێمە بیرمان لە ئەنجامە ڕووخێنەرە کارەساتهێنەکانی ئەو ئەلفوبێیە نەکردووەتەوە، ئەگەرنا، ناکرێ لە لایەکەوە هۆشیار بین کە چ مەترسییەکی گەورەی لەسەر هەموو زمان و فەرهەنگ و ناسنامەی نەتەوایەتیمان هەیە و لە لایەکی دیکەیشەوە داوا بکەین لە هەندێ پلەی خوێندندا ئەو ئەلفوبێیە بە کار ببرێت. باوەڕ ناکەم هیچ ڕووناکبیر یا زمانزانێکی چینی یا فارس یا جاپانی ڕێگە بدات زمانەکەی بە ئەلفوبێیەکی دیکە بنووسرێت و بخوێنرێت، نەک لە ناوخۆی وڵاتەکەیاندا، بگرە بۆ ئەو منداڵ و لاوانەیشیان کە لە ئەورووپا و ئەمەریکا دەژین. ئەوەی دەیەوێ زمانی چینی یا فارسی یا جاپانی فێر ببێت، دەبێ بە ئەلفوبێی چینی و فارسی و جاپانی فێری ببێت، نەک بە ئەلفوبێیەکی دیکە. ئەمە ڕاستییەکە نە دەمەتەقێ هەڵدەگرێت و نە هیی ئەوەیە بە ئاسانی لێی بنەوین.
هەندێ لە مامۆستایان پێشنیازی ئەوە دەکەن کە لە قۆناغێکی خوێندندا ئەلفوبێی لاتینی لەپاڵ ئەلفوبێی کوردیدا لە سیستەمی پەروەردەدا بە کار ببرێت بۆ خوێندنی دیالێکتی کرمانجی (کرمانجیی سەروو). من ئەم پێشنیازەم پێ ڕاست نییە و لەو باوەڕەدام کە هەبوونی بیرێکی وەها لە ناشارەزایی و نائاشنابوونی ئەو ئەلفوبێیە و ئەو ئەنجامە کارەساتاوییانەوە دێت کە بەسەر کوردیاندا هێناوە. من دژی ئەوە نیم و پێیشم باشە لە پلەکانی ناوەندی و ئامادەییدا نموونەی ئەدەبی کرمانجی (بە ئەلفوبێی کوردی) و هەورامی بخوێنرێت لەگەڵ ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی تێکستەکان بە کوردیی خواروو، لە پلەی زانستگەیشدا لە کۆلێژەکانی زمان و ئەدەبی کوردیدا هەم ڕێزمانی ئەو زاراوانە بە شێوەیەکی قووڵتر بخوێنرێت و هەم نموونەی شیعر و فۆلکلۆر و ڕۆمان و شانۆنامە و مێژووی فەرهەنگ و ئەدەبیش،

هەروەهایش لێکۆڵینەوەی زانستییان لەبارەوە بکرێت، لە چواچێوەی زانستیی زاراواناسی (دیالێکتۆلۆگی Dialectology)دا، واتە زانستی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی دیالێکتەکانی زمان.
یەکێ لەو زانیارییە هەڵانەی کە لەناو بەشێکی زۆری خوێنەران و تەنانەت نووسەر و ڕووناکبیرانیشدا بڵاو بووەتەوە ئەوەیە گوایە بەشی زۆرترینی خوێنەری کورد بە لاتینی دەخوێنێتەوە، بەو حیسابەی کوردی تورکیا و سووریا و ڕووسیا پێی دەخوێننەوە، ئەگەرچی بەشی هەرە زۆری نووسین و فەرهەنگی کوردی بە ئەلفوبێی کوردی دەنووسرێت. بەشی دووەمی ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام بەشی یەکەمی زۆر ناڕاستە و هیچ بناغەیەکی نییە. هەروەها ئەو باوەڕەیش بێبناخە و هەڵەیە کە پێی وایە ئەوەی ئەمڕۆ کوردی تورکیا و سووریا بە ئەلفوبێی تورکی لاتینی دەینووسن بەرهەمێکی زۆر و فراوان و پێشکەوتووە، لە کاتێکدا ئێمە دەزانین ئەو بەرهەمە نە لە ڕووی چەندایەتی و نە لە ڕووی چۆنایەتییەوە قورسایی و نرخێکی ئەوتۆی نییە. من نازانم لە سەدا چەندی کوردی تورکیا و سووریا خوێنەوارن، بەڵام دڵنیام ئەوانەی کە خوێنەوارن بە زمانێکی دیکە خوێنەوارن نەک بە زمانی خۆیان (لە سووریا عەرەبی، لە تورکیا تورکی، لە سۆڤیتی جاران بە ڕووسی، ئەرمەنی، ئازەربایجانی و گورجی)، ئیتر نازانم ئەم میتۆلۆگییە لە کوێوە هاتووە؟ لە کاتێکدا خوێنەری کوردستانی عیراق، بە تایبەت، لاوانی ئەمڕۆ، کە خوێنەوارن، لە سەدا سەد بە کوردی خوێنەوارن و زمانی یەکەمی خوێندن و نووسینیان کوردییە. لە کوردستانی ئێرانیش نیسبەتێکی زۆری خوێنەوارانی کورد، بەتایبەت لە هەرێمەکانی موکریان و ئەردەڵان، لەپاڵ فارسیدا کوردییش دەخوێننەوە، ئەگەرچی بە بەراورد لەگەڵ کوردستانی عیراقدا زۆر کەمترە، بەڵام دەیان جار لە کوردی تورکیا و سووریا لە زانینی زمانی کوردی و خوێندنەوەیدا پێشکەوتووترن. باوەڕ ناکەم لە ١٢-١٥ میلیۆن کوردی تورکیا ١٢-١٥ هەزار خوێنەری کورد هەبن.

هەندێ لە نوختەی دەرچوونەکانی لێکۆڵەرەوە و باسکارانی کورد لەم بوارەدا دوورن لە ڕاستیی هەلومەرجی زمانی کوردییەوە، بۆ نموونە کاتێ وا باسی ئەلفوبێی لاتینی و نووسینی کرمانجی بە لاتینی دەکەن وەک بڵێی هەموو کوردی تورکیا، بە دە پانزدە میلیۆنەکەیەوە، شەووڕۆژ خەریکن بە کوردی دەنووسن و دەخوێننەوە و مانگانە سەدان ڕۆمان و هەزاران دیوانەشیعر بە کوردی دەنووسن و بڵاو دەکەنەوە، لە کاتێکدا ڕاستییەکە ئەوەیە کە لە کوردستانی تورکیادا کوردی زمانێکی زیندوو نییە، هەر نەبێ زمانێکی زیندووی نووسین و خوێندنەوە نییە. خۆ زمانی فارسی لە کوردستانی عیراقدا زمانێکی ڕەسمی نییە، بەڵام خەڵکێکی زۆری خوێندەوار فارسی دەزانن و پێی دەخوێننەوە و قسەیشی دەتوانن پێ بکەن. ئەگەر بە ڕێژەی لەسەدا (%) وەریبگرین ژمارەی فارسیزانەکانی کوردستانی عیراق لە ژمارەی کوردیزانەکانی کوردستانی تورکیا زۆرترن. من بۆیە فارسیم باس کرد، نەک عەرەبی، چونکە عەرەبی ماوەی هەشتا نەوەد ساڵە زمانی ڕەسمی و زمانی خوێندن بووە و خەڵکێکی زۆر دەیزانن و بووەتە زمانی فەرهەنگییان، بەڵام فارسی زمانێکە خەڵک بۆ خۆی، ئەگەر حەزی لێ بووبێت، فێری بووە، لەگەڵ ئەوەیشدا فارسیزانەکانی کوردستانی عیراق لە کوردیزانەکانی کوردستانی تورکیا زیاترن.

هەروەها ئەو گریمانەیەیش ڕاست نییە کە پێی وایە کوردی تاراوگە (کوردی دەرەوەی وڵات)، لە خوێندن و نووسینی زمانی کوردیدا ئەلفوبێی تورکی/لاتینی بە کار دەهێنن. من ماوەی چوار ساڵ (١٩٨٤-١٩٨٨) لە خوێندنگەی بەرزی مامۆستایانی ستۆکهۆڵم مامۆستای زمانی کوردی بووم و بەشی هەرە زۆری ئەوانەی لە وڵاتی سوێد مامۆستایەتیی زمانی کوردی دەکەن و دەرس بە منداڵی کورد دەڵێنەوە لای من خوێندوویانە. ئێستایش لە زانستگەی ئوپسالا مامۆستای زمانی کوردیم و خوێندکارەکانمان تێکەڵاوییەکن لە کورد و سوێدی و نۆروێژی و فینلاندی و نەتەوەی دیکە. لەبەر ئەوە ئاگادارییەکی باشم لەبارەی خوێندنی کوردییەوە لە سوێد و تا ڕادەیەکیش لە وڵاتانی دیکە هەیە. دیاردەی هەرە بەرچاو لەو بوارەدا

ئەوەیە کە منداڵی کورد بەسەر ئەو دوو جۆرە ئەلفوبێیەدا دابەش کراون؛ منداڵانی کوردستانی تورکیا و سووریا بە ئەلفوبێی لاتینی فێری کوردی دەکرێن و منداڵانی کوردستانی ئێران و عیراقیش بە ئەلفوبێی کوردی. نووسەر و ڕووناکبیرانی کوردیش لە ئەورووپا بەشی هەرە چالاک و بەرهەمداریان ئەوانەن کە لە کوردستانی ئێران و عیراقەوە هاتوون و بە کوردیی ناوەڕاست (یا کوردیی خواروو) دەنووسن.

ئێمە ناتوانین باسی ژیانێکی فەرهەنگیی کوردی لە تورکیا یا تەنانەت لای کوردی تورکیا لە دەرەوەیش بکەین. ئەگەر لە وڵاتێکی وەک سویددا کە بواری فێربوونی کوردی لە هیی هەموو وڵاتانی ئەورووپا چاکترە، بیستوپێنج سی نووسەری کرمانجینووس و سەد، سەدوپەنجا خوێنەری کرمانجی هەبن، ئەمە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئەدەبێکی گەشەکردوو، یا فەرهەنگێکی بتەو و دامەزراو بە کرمانجی هەیە. زۆرجاریش لە ڕێژەی ئەو ئەدەبەدا کە بە زاراوای کرمانجی و بە لاتینی دەنووسرێت بە هەڵەدا دەچن و پێیان وایە شتێکی زۆری پێ دەنووسرێت. ڕاستییەکەی ئەوەیە هەموو ئەوەی بە کرمانجی و بە ئەلفوبێی لاتینی دەنووسرێت ناگاتە ١٠%ی سەرجەمی ئەوەی بە هەموو زمانی کوردی دەنووسرێت. بەشی هەرە زۆری ئەدەب و نووسینی کرمانجی ئەوەیە کە بە شێوەی بادینانی و لە کوردستانی عیراقدا دەنووسرێت. ئەوەیش، دەزانین، بە ئەلفوبێی کوردی دەنووسرێت نەک ئەلفوبێی لاتینی تورکی. لە ڕووی ناوەڕۆک و ئێستێتیکیشەوە ئەو ئەدەبەی بە شێوەی بادینانی دەنووسرێت (بەتایبەت شیعر و لێکۆڵینەوە و تەرجەمە) زۆر لەو ئەدەبەی لە لایەن نووسەرانی کوردی تورکیا و سووریا و سۆڤییێتی جارانەوە دەنووسرێت پێشکەوتووتر و دەوڵەمەندترە.

## دووەم: گۆشەنیگایەکی زانستی و زمانەوانی

### ئەلف: کرۆکی کێشەکە؛ خوێندنەوەیەکی مێژوویی

گوتوبێژ و نووسین لەسەر مەسەلەی زمانی یەکگرتوو، زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، زمانی ستاندارد و زمانی ڕەسمی (ئەمەی دوایین کەمتر) لە ڕابوردوویشدا لەناو نووسەر و ڕووناکبیرانی کورددا، لە باشووری کوردستان یا کوردستانی عیراقدا، هەبووە و جاروبار بە شێوەی وتار و لێکۆڵینەوەیش سەری هەڵداوە. لەبەر ئەوەی لە لایەکەوە ڕاگەیاندنێکی پێشکەوتووی کوردی لە ئارادا نەبووە، لە لایەکی دیکەیشەوە ژمارەی کەسانێک کە بتوانن لە بابەتێکی زانستیی وەهادا بەشدارییەکی جیددی و چالاکانە بکەن یەکجار کەم بووە، ئەو گوتوبێژانە ئامانجێکیان نەپێکاوە و لە ئاستێکی بەرزی زانستیدا نەکراون. لەو بوارەدا هەرچییەک نووسرابێت تا ڕادەیەکی زۆر لە گۆشەنیگایەکی تیۆرییەوە لە بابەتەکە نزیک کەوتووەتەوە. ئەمەیش، پێم وایە، ئەنجامی سێ هۆی گرنگ بووە:

یەک: هەلومەرجێکی سیاسیی وەها لە ئارادا نەبووە کە کورد بتوانێت زمانەکەی خۆی بکاتە زمانێکی ڕەسمی لە عیراقدا، یا هەر نەبێت لەو بەشەی کوردستاندا. تەنانەت لە ڕێککەوتننامەی ١٩٧٠-١٩٧٤دا، ئەگەرچی زمانی کوردی پلەی زمانی دووەمی ڕەسمیی لە کوردستاندا پێ درابوو، بەڵام هەرگیز ڕێگە نەدرا ئەو ڕۆڵەی هەبێت؛

دوو: لە ماوەی نزیکەی هەشتا ساڵدا کە زمانی کوردی کەموزۆر زمانی خوێندن و پەروەردە بووە لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا، کوردیی خواروو، یا کوردیی ناوەندی، تاکە دیالێکتێکی کوردی بووە کە بتوانێت ئەو نەخشەی هەبێت و تاکە شێوەی زمانی کوردی بووە کە بە کردەوە و بەڕاستی یارای ئەرکێکی وەها بێت؛

سێ: سەرکردایەتیی سیاسیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردستان، لەبەر گەلێ هۆی سیاسی و فەرهەنگی، هیچ دوودڵییەکی لەو ڕووەوە نەنواندووە و زۆر دڵنیا بووە لەوەی کە دەبێ کوردیی خواروو زمانی خوێندن و زمانی سیاسەت و زمانی ڕاگەیاندنی

کوردی بێت، هەرچەندە ئەو بوارانە زۆریش فراوان و پێشکەوتوو نەبووبێتن.
لە دوو ئەزموونی سیاسیی سەربەخۆییدا لە کوردستان، حوکوومەتی شێخ مەحموود و کۆماری دیمۆکراتی کوردستان لە مەهاباد، هەبوونی پرسیارێکی لەو بابەتە پێویستییەکی نە سیاسی و نە زانستی و نە فەرهەنگی نەبوو، چونکە هەم ناوچەی دەستەڵاتی هەردوو دەوڵەتەکە و هەم ڕێبەرایەتییەکەیان تەنیا پیادەکردن و جێبەجێکردنی یەک مۆدێل و یەک شێوەیان لە بەردەستدا بوو. لە ئەزموونی تازەتری کوردستانی خوارووودا لە ساڵی ١٩٥٩ وە (ئەو ساڵەی کە مەلا مستەفای بارزانی گەڕایەوە و بە کردەوە بوو بە ڕێبەری گەلی کورد) هەتا ١٩٧٥، کە گەورەترین و گرنگترین بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردستان تێک شکا و هەرەسی هێنا، پێکهاتەی بزووتنەوەکە و ناوچەی دەستەڵاتی سیاسی و کارگێڕیی، گۆڕانێکی گەورەیان بەسەردا هات. لەم قۆناغەدا بوو کە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردستاندا زمانی کوردی لە پلەیەکی بەرزتری زانستی و فەرهەنگی و سیاسیدا بە کار هێنرا، لەم قۆناغەدا بوو زمانی کوردی لە ناوچەیەکی فراوانتری کوردستاندا بوو بە زمانی پەروەردە و خوێندن و ئەو مندالانەی پێیان دەخوێند و ئەو مامۆستا و پەروەردەکارانەی بۆ فێرکردن بە کاریان دەهێنا، لە ڕووی ناوچە و ئینتیمای کۆمەلایەتی و چینایەتی و شێوەزمانی قسەکردنەوە پاشخانی تەواو جۆراوجۆر و جیاوازیان هەبوو، هەر لەم قۆناغەیشدا بوو کە لەوانە بوو زمانی کوردی ببێتە پاژنەی "ئەشیل"ی [Achilles'heel] بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردستان، ئەگەر دوژمنەکانی هەلی ئەوەیان دەست بکەوتایە ئەو مەسەلە هەرەناسکەیان بە کار بهێنایە.
سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستانی عیراق بە ڕێبەرایەتیی مەلا مستەفای بارزانی زۆر دووربینانە، ژیرانە، بەرپرسیارانە و نیشتمانپەروەرانە بیری کردەوە، کاتێ بە هیچ جۆرێک لەم ڕووەوە سازشی نەکرد و کەمترین نیشانەی دوودڵی و ڕاڕایی لە بیر و بڕیاریدا دەرنەکەوت. ئەم هەڵوێستە بە تایبەتی لە چوارساڵی ١٩٧٠-

١٩٧٤ی ڕێککەوتننامەکەدا بوو بە کۆڵەکەیەکی سەخت و پتەوی یەکخستنی کورد وەک نەتەوەیەک و داڕشتنی بنەڕەتێکی هۆشیارانە بۆ چەسپاندنی هەستی نەتەوایەتی و خۆبەکوردزانین. دوژمنێکی وەک حیزبی بەعس بە سەرکردایەتیی سەددام حوسەین نەیتوانی لە درزی زمانەوە دەست بۆ ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵی کوردستان ببات و نەیتوانی ئەو بابەتە بۆ سوودی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانی خۆی بە کار ببات. کەچی هەر دوای هەرەسهێنانی ئەو بزووتنەوەیە یەکێک لە مێتۆدە هەرە ترسناکەکانیان بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد، بەکارهێنانی زمان و فەرهەنگی کورد بوو. هەر ئەو ڕێژیمەیش بوو کە دەستی کردە بڵاوکردنەوەی دوو ڕۆژنامەی ڕۆژانە؛ ئاسۆ و بزاڤ، یەکەمیان بە کوردیی خواروو، دووەمیشیان بە شێوەی بادینانیی کوردی سەروو. دەبێ هۆی چی بێت کە ڕێژیمی بەعس، ڕێک لە سەردەمێکدا کە کورد لە ڕووی سیاسییەوە هەرەسی هێنابوو، ئەوەندە دێمۆکرات و دڵسۆزی فەرهەنگ و زمانی کوردی بێت کە ڕێگە بدات دووڕۆژنامەی دیکەیش بە کوردی بڵاو بکرێنەوە؟

بەڕاستی ئەم سیاسەتەی بەعس درێژەپێدانێکی هەر ئەو سیاسەتە بوو کە لە چلەکاندا هەردوو ئیمپەریالیزمی بریتانی و فرانسی بە کاریان هێنا، کاتێ دەستیان کردە کۆمەککردنی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکانی هاوار و ڕۆناهی و ستێر و ڕۆژا نوو، لە شام و لە بەیرووت، بە کرمانجی و بە ئەلفوبێی لاتینی و کاتێ دوو وەستگەی ڕادیۆیان بە زمانی کوردی دانا؛ یەکیک لە بەیرووت بە کوردیی سەروو، کرمانجی، و یەکێکیش لە یافای فەلەستین بە کوردیی خواروو. ساڵانێکی زۆر پێشتریش میسیۆنێرە مەسیحییەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا چالاکانە کاریان دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحییەت و ئینجیل (بایبل)یان تەرجەمەی دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی دەکرد و بە خۆڕایی لە شار و ناوچەکانی کوردستاندا دەیانبەشییەوە. کەواتە زمان یەکێکە لەو پردە گرنگانەی کە کۆلۆنیالیستان، ئیمپەریالیستان و داگیرکاران هەمیشە هەوڵیان داوە لێیەوە بپەڕنەوە بۆ داگیرکردن و پارچەپارچەکردن و تێکشکاندنی نەتەوەی کورد و نیشتمانەکەی.

له سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەوە، بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کورد لە باشووری کوردستاندا، جۆرێک دەسەڵاتی گرتووەتە دەست و لە هەموو کایەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەربازی و کارگێڕی و فەرهەنگی و ئابووریدا خاوەنی بڕیار و نەخشەدانەری سیاسەت بووە. ئەم دەسەڵاتە بەسەر دوو قوتب و دوو هێزی گەورەی سیاسیدا دابەش بووە؛ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتیی دیمۆکراتی کوردستان. ئەم دوو هێزە ساڵانێکی دوورودرێژ ناکۆکی و دژایەتییان گەیشتە ڕادەی شەڕێکی خوێناوی، کە ئەنجامەکەی سەرلەنوێ دابەشکردنی ئەو بەشەی کوردستان بوو لە ڕووی سەربازی و سیاسی و ئابووری و فەرهەنگییەوە، بەڵام هەروەهایش لە ڕووی پەروەردە و زمانەوانی و سایکۆلۆگییەوە.
یەکێک لە دەرئەنجامە ڕەش و دزێوەکانی ئەم شەڕە، لەپاڵ کۆمەڵێ ئەنجامی کارەساتباردا، دابەشبوونی زمانی کوردی و سیستمی پەروەردە بوو. بە دروستبوونی دوو ناوچەی کارگێڕی و سیاسی، کەرتبوونێکی ترسناک لە دەستگاکانی ڕاگەیاندنیشدا پەیدا بوو. بێجگە لەوەی کە ماکینەی ڕاگەیاندنی هەردوو لا هەرچییەکیان لە دەست هات لە بەکارهێنانی زمانێکی ناشیرینی بە ڕق و درۆ و گومان ئاخنراو بەرانبەر یەکتر و بەرانبەر مێژووی نەتەوەی کورد، تەنانەت وشەی کوردییش لەو دابەشبوون و دزێوکردنە ڕزگاری نەبوو، تا ئەو ڕادەیەی کە هەر ناوچەیەک کۆمەڵێ وشە و دەربڕینی تایبەتی خۆی هەبێت و بیانکاتە نیشانەی خۆجیاکردنەوە لە ئەوی دی. هەر وەک نموونە دەڵێم، وشەکانی (بازگە و ژن و خوێندکار) کەوتنە لایەک و وشەکانی (زاڵگە و ئافرەت و قوتابی)یش کەوتنە لایەکەی دیکە. ئەمانە لەو جۆرە زیان و تێکشکانانە بوون کە ئەنجامە ژاراوییەکانیان هەر وا بە ئاسانی تیمار ناکرێن.

ئەو هەلومەرجە لێڵ و پڕ لە ئاژاوە و بەربەرەکانییە دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ دەیان بەناو نووسەر و ڕووناکبیری هەلپەرست و بوودەڵە و ناجوامێر و نەخوێندەوار، کە خۆ ببەنە پێشەوە و لە پێناوی هەندێ

دەستکەوتی ماددی و پلە و پایەدا، هەموو سووکایەتییەک بە زمان و فەرهەنگی کورد بکەن و ڤیرووسی نەخوێندەواری و دواکەوتن بڵاو بکەنەوە. لە سێبەری ڕەشی ئەو ناکۆکییەدا دوو دیاردە، یا دوو ڕووداو، پەیدا بوون کە بوون بە پێشینەیەکی ڕەش و پڕ لە نەهامەتی بۆ زمان و فەرهەنگی کورد: بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی تورکی لە تەلەڤیزیۆنەکانی کوردستاندا و گۆڕینی سیستەمی پەروەردە و خوێندن لە ناوچەی دهۆک و سەپاندنی شێوەزمانی بادینانی لەجێی زمانی ستانداردی کوردی لە پۆلەکانی قۆناغی سەرەتاییدا. لە هەردوو بارەکەیشدا ئەوەی کە ڕۆڵێکی زۆر نەخوێندەوارانە و تێکدەرانە و ناکوردانەی بینی هەندێ زڕەڕووناکبیر و زڕەنووسەری کوردستانی تورکیا بوون، کە بەشێکی زۆریان لە بنەڕەتدا چالاککاری ناو حیزب و تاقمە چەپەکانی سەر بە سۆڤییێتی جاران بوون. ئەمانە بە درێژیی ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی ڕابوردوو بە شێوەیەکی پەرگرانە و بێتام سۆڤییێتپەرست بوون و لە شیکردنەوەی سیاسییاندا هێڵێکی ڕەشیان چەپوڕاست بەسەر ئێستا و ڕابوردووی نەتەوەی کورددا دەهێنا. زۆر بەتایبەت دژی سەرکردایەتیی پارتیی دیمۆکراتی کوردستان و بنەماڵەی مەلا مستەفای بارزانی بوون، بەڵام کاتێک کە ڕێژیمی سۆڤییێت ڕووخا و سەرچاوەی بیرکردنەوە و بژێوی ئەمانیش وشکی کرد، زۆر خێرا بەرەو نەتەوەپەرستییەکی ناهۆشیارانە و ڕۆژاواپەرستی و ناوچەپەرستی و دیالێکتپەرستی ڕۆیشتن. دامەزرانی هەرێمی کوردستانی عیراق و شەڕی براکوژی دەرفەتێکی چاک بوو بۆ ئەمانە کە خۆیان لە هەردوو پارتییە گەورەکانی کوردستانی عیراق، پارتی و یەکێتی، نزیک بخەنەوە بە ئامانجی پارەخواردن و خۆژیاندن و بازرگانی. لە ڕووی زمان و فەرهەنگەوە ئەمانە بەڕاستی نەخوێندەوار بوون و هیچیان پێ نەبوو. لە زمان و فەرهەنگ و مێژووی کورددا تەواو ناشارەزا و کۆڵەوار بوون. هونەرێک کە چاکیان لێ دەزانی و لە ئەورووپا فێری بووبوون، داڕشتنی پرۆژەی درۆینەی فەرهەنگی و سیاسی و پەروەردەیی بوو. دەیان پرۆژەیان دەخستە بەردەم سەرکردایەتیی سیاسیی کوردستانی عیراق و

میلیۆنان دۆلاریان پێ وەردەگرت، بێ ئەوەی پرۆژەکانیان هیچ ئەنجامێکی هەبێت و هیچ سوودێک بە ئەزموونی کوردستان بگەیێنێت. لەناو ئەمانەدا "ئەنیستیتووتی کوردی لە پاریس" و "فەدەراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکان لە سوێد" و "کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم" و هەندێکی دیکە لە هەمووان زیاتر بەهەڵپە بوون و هێرشبەرانە کاریان دەکرد. زۆریش هەبوون وەک تاکەکەس، بەو ناوەوە کە شارەزای زمان یا پەروەردەن، پرۆژەیان پێشکەش دەکرد و پارەیان پێ وەردەگرت.

کرانەوەی سنوورەکانی نێوان دوو بەشە کوردستانی تورکیا و عیراق و ئەو پێوەندییەی لە ئەنجامی دامەزرانی هەرێمی کوردستانی عیراقدا پەیدا بوو، دەبوو ببێتە هەلێک و دەرفەتێک بۆ کوردی تورکیا کە سوود لە ئەزموونی فەرهەنگی و زمانەوانیی کوردستانی عیراق وەربگرن. لە پێوەندییەکی وەهادا هەڵوێستی سروشتی ئەوەیە کە خەڵکێکی نەزان و ناشارەزا سوود لە ئەزموونی خەڵکێکی لێزان و شارەزا وەربگرن. ئەوان دەیانتوانی بە ئاسانی خۆیان فێری کوردی بکەن و وردەوردە زمان و فەرهەنگ و ئەلفوبێی کوردی بگوێزنەوە بۆ ناو لاوانی کوردستانی تورکیا و بزووتنەوەیەکی گەورەی فەرهەنگی لەو بەشەی کوردستاندا دروست بکەن. ئەودەم سووک و ئاسان هەموو ڕۆژنامە و کتێب و چاپەمەنییەکانی کوردستانی عیراق دەگەیشتنە دەست خوێنەری کوردستانی تورکیایش. هەر لەو ڕێگایەیشەوە ئەلفوبێی کوردی دەبوو بە سیمبۆلی بەرگری و خەباتی سیاسیی ئازادیخوازانە دژی داگیرکارانی تورک و گەڕانەوە بۆ ڕەگوڕیشەی کوردایەتی و زمان و فەرهەنگی کورد. ئەودەم لەجێی ئەوەی شەڕ لەپێناوی دوو حەرفی (و، خ)دا بکەن، دەیانتوانی شانازی بە هەموو تیپەکانی ئەلفوبێی کوردییەوە بکەن و بیانکەنە سنووری جیاکردنەوەی خۆیان لە تورک و لە فەرهەنگ و بیرکردنەوە و ئیدیۆلۆگیی کەمالیزم. ئەگەر بەراوردێک لەنێوان پێوەندیی دوو بەشی کوردستانی تورکیا و ئێران لەگەڵ هەرێمی کوردستانی عیراقدا بکەین جیاوازییەکە وەک ڕۆژی نیوەڕۆ دیارە و بە بەرچاوەوەیە. وەک

پێشتریش باسم کرد؛ ئێستا ئەگەر کۆماری ئیسلامیی ئێران زمانی کوردی بە ڕەسمی قەدەغە بکات و ڕێگە نەدات تەنانەت یەک دانە لاپەڕە و یەک دانە حەرف بە زمانی کوردی چاپ بکرێت، خوێنەرانی کوردستانی ئێران پەکیان ناکەوێت، چونکە سامانی گەورە و دەوڵەمەندی فەرهەنگ و زمانی کوردیی کوردستانی عیراق گەنجینەیەکە کە ئەوانیش دەتوانن سوودی لێ وەربگرن.

من نامەوێ هەموو تاوانی پەیدابوونی گومانکردن لە زمان و ئەلفوبێی ستانداردی کوردی و ئەو ئاژاوەیەی ئێستا لە بواری زماندا پەیدا بووە بخەمە ئەستۆی زرەڕووناکبیر و زرەنووسەرەکانی کوردستانی تورکیا. ئەگەر ئەوان بە نەزانی و ناهۆشیاری و نەخوێندەواریی خۆیان ئاگری ئەم ئاژاوەیە خۆش دەکەن، بەڵام بۆچی سەرکردایەتیی سیاسیی کورد و نووسەر و ڕووناکبیرانی دەستوپێی دەستەڵاتی سیاسی ڕێگە دەدەن سامانێکی گەورەی نەتەوایەتی بەم شێوەیە هەڵوەشێنرێتەوە و وێران بکرێت؟ دوو زلهێزە سیاسییەکەی کوردستانی عیراق، پارتی و یەکێتی، پێیان وایە بە ڕاکێشانی هەندێ هەلپەرست و کۆلکە خویندەواری کوردی تورکیا دەتوانن لەو بەشەی کوردستاندا پێگەیەکی سیاسی بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن و گەلی کوردستانی تورکیایش بخەنە ژێر ڕکێفی سیاسیی خۆیانەوە. بێگومان بۆ بەربەرەکانێی یەکتریش هەردوو لایان پەلەیانە کامیان زووتر دەستی بگاتە ئەو بەشەی کوردستان و بە لای خۆیدا ڕایبکێشێت. هەر لەو پێناوەیشدا ئامادەن لەسەر هەموو شتێک، تەنانەت شتە پیرۆز و دامەزراوەکانیش، سازش بکەن.

ئێمە ئەگەر بە ڕەگوڕیشەی کێشەکانی ئەمڕۆی زمانی کوردیدا بچینە خوارێ، بێگومان چەند هۆیەکی جیاوازی فەرهەنگی و سیاسی و ئیدیۆلۆگی و کۆمەڵایەتی دەدۆزینەوە کە بوونەتە ماکی ئەم ئاژاوە و پشێوییەی بەرۆکی زمانەکەی گرتووە. هەندێک لەو هۆکارانە مێژوویین، بەو مەعنایەی کە هەر لەگەڵ گەڵاڵەبوونی شێوەکانی زمانی کوردیدا وەک زمانێکی ئەدەبی، هەلومەرجێکی وەها لە ئارادا بووە کە ڕێگە لە تەشەنەکردنی ئەو شێوەیە بگرێت و سنوورێکی بۆ دابنێت. لە

ئەنجامدا درز و جیاوازیی گەورە لەنێوان شێوەی ناوچەکاندا پەیدا بووە. دەکرێ ئەم جۆرە هۆکارە بە ماکی جیاوازییە دیاکرۆنیکەکانی (Diachronic) زمانی کوردی دابنێین. بەرانبەر بەو جیاوازییانەیش ئێمە کۆمەڵێ جیاوازیی سینکرۆنیکیش (Synchronic) دەبینین، کە هۆکارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بوونەتە ماکیان.

بەڕاستی من پێم وایە نە جیاوازییە دیاکرۆنیکەکان و نە جیاوازییە سینکرۆنیکەکان کێشەی ترسناک و ڕاستەقینەی ئەمڕۆی زمانی کوردی نین. ئەو جۆرە جیاوازییانە لە هەموو زمانەکانی دنیادا هەبوونە و هەن و دەبن. کێشەی ئەمڕۆی زمانی کوردی چەندە کێشەیەکی زمانەوانییە، هێندەیش و زۆر لەوەیش زیاتر کێشەیەکی سیاسی و ئیدیۆلۆگی و شارستانییە، کێشەی ناشارەزایی و نەناسین و نەزانینی ناسنامەی نەتەوایەتییە.

## بێ: ئاژاوەی چەمکەکان: زمانی یەکگرتوو، ئەدەبی، ستاندارد، ڕەسمی؟

بۆ ئەوەی لە کێشەکانی زمانی کوردی نزیک بکەوینەوە، دەبێ هەوڵ بدەین لە ڕەهەندە جیاوازەکانی تێبگەین و بە جۆرێک لێیان ورد ببینەوە کە ناوەڕۆکی ڕاستبێژەکان نەکەونە بەر تاریکیی گۆڕین و زڕەزانست. ئەمڕۆ لە کوردستاندا ئەگەرچی گوتوبێژێکی فراوان لەسەر زمانی کوردی و کێشەکانی دەکرێت و زۆر بابەتی نووسراو بڵاو دەکرێنەوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بەشی هەرەزۆری ئەو نووسین و بابەت و گوتوبێژانە دوورن لە پێوەر و بنەما زانستییەکانەوە. بەشێکی زۆری ئەوانەی لەو گوتوبێژانەدا بەشداری دەکەن بە ئاشکرا ڕاستییە بنەڕەتییەکانی زمان و زمانەوانی دەگۆڕن و کۆمەڵێ زانیاریی ناڕاست بڵاو دەکەنەوە بە مەبەستی چەواشەکردنی خوێنەر و ڕاکێشانیان بە لای بیر و بۆچوونەکانی خۆیاندا. ئەو چەمکانەی ئەو جۆرە نووسەرانە بە کاریان دەبەن لە ناوەڕۆکی ڕاستەقینە و زانستیی خۆیان خاڵی کراون و ناکرێت گوتوبێژێکی ساغ و تەندروست بەو کەرەستە ناڕێک و شێوێنراوانە ئەنجام بدرێت.

ئەگەر باس لە دووزمانەیی و فرەزمانەیی بکەین دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە تەقریبەن هەموو وڵاتانی دنیا فرەزمانەن بەو مەعنایەی کە دانیشتووان بە زیاتر لە یەک زمان قسە دەکەن و دەدوێن، بەڵام لەناو هەموو وڵاتانی دنیادا ڕەنگە ژمارەیەکی کەمیان، لەیەک زمانی ڕەسمی زیاتریان هەبێت، واتە ئەو زمانەی لە کارگێڕیی دەوڵەتدا بە کار دەبرێت و لە پێوەستی دیکەی ڕەسمیدا. دۆخی دووزمانەیی یا فرەزمانەیی زۆرجار لە دەستووری وڵاتەکەدا دەچەسپێنرێت، بەڵام جاری وایش هەیە دوای نەریتێک دەکەون. زۆر ئاساییە وڵاتێکی فرەزمانە تەنیا یەک زمانی ڕەسمیی هەبێت، بۆ نموونە فرانسی لە ساڵی ١٥٣٩ وە تاکە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت بووە لە فرانسا، ئەگەرچی زۆر زمانی دیکەی کەمایەتی لە وڵاتەکەدا هەبووە: ئۆکسیتانی، بریتۆنی، باسکی، ئێلساسی، کۆرسیکانی، سەرەڕای کۆمەڵێ زمانی دیکەیش کە بە دیالێکتی زمانی فرانسی دادەنرێن.[٢٤]

## وڵاتانی دووزمانە یا فرەزمانە:

فینلاند: هەردوو زمانی فینی و سوێدی "زمانی کۆمارن". کەچی زمانی سامی، واتە زمانی سامەکان کە کەمایەتییەکی ئەتنیکی و زمانەوانین، بەم دواییە پلەیەکی دراوەتێ، بەڵام نەک وەک زمانێکی ڕەسمی. لە فینلاند مەرج نییە دووزمانەیی لە سەرتاسەری وڵاتەکەدا جێبەجێ بکرێت، بەڵکە بەپێی شارەوانی و ناوچەی جیاواز قانوونەکە بە شێوەی جیاواز دەخرێتە کارەوە. لە هەندێ شارەوانیدا یا تەنیا زمانی فینی یا تەنیا سوێدی زمانی ڕەسمییە، بەڵام لە هەندێ ناوچە و شارەوانیدا هەردوو زمانەکە ڕەسمین، بۆ نموونە لە هێلسنکیی پێتەخت.

بەلژیک: سێ زمانی ڕەسمیی هەیە؛ زمانی هۆڵاندی (بە شێوەی ناوچەیی، کە پێی دەگوترێت فلاملێندی)، فرانسی و دواتریش ئەڵمانی پلەیەکی وەهای پێ دراوە. لە بەلژیک چوار هەرێمی زمانەوانی هەن، سێیان لەو جۆرەن کە تەنیا یەک زمانی ڕەسمیی تێدایە؛ هۆڵاندی،

---

[24] Dahl, Östen: Språkets enhet och mångfald, Studentlitteratur, 2007.

فرانسی یا ئەڵمانی. هەرێمی چوارەم بروکسەلی پێتەختە کە دووزمانەیە.
خوارووی ئەفریقا: یانزدە زمانی ڕەسمیی هەیە: ئینگلیزی، ئەفریکانس، زوولوو، سۆتۆی باکوور، خۆسا، سۆتۆی باشوور، تسوانا، تسۆنگا، سوازی، ندێبێلە، ڤاندا.
حاڵەتێکی زۆر تایبەت ئەوەیە کە وڵاتێک یەک زمانی قسەکردنی هەبێت (بە دیالێکتی جیاوازەوە) بەڵام دوو یا چەند زمانی ڕەسمیی هەبێت بۆ نووسین، یا شێوەی جیاوازی زمانی نووسین. لە نۆروێژ: هەردوو زمانی بووکمۆل (جاران ڕیکسمۆل) و نوینۆرشک (جاران لاندسمۆل)، زمانی ڕەسمیی وڵاتەکەن. بووکمۆل: ئەو زمانی نووسینەیە کە کارکردی یەکجار گەورەی زمانی دانی [دانمارکی]ی لەسەرە، چونکە دانمارک نزیکەی ٤٠٠ ساڵ حوکمی ئەو وڵاتەی کردووە، ئێستا زۆربەی خەڵکی نۆروێژ بەم زمانە دەنووسن. بووکمۆل ئەمڕۆ (لە ساڵی ١٩٢٩وە) ناوی شێوەزمانی ڕەسمیی دەوڵەتی نۆروێژە. زۆرایەتیی خەڵکی نۆروێژ (٨٨-٩٠%) بە زمانی بووکمۆل دەنووسن. لە بواری چاپەمەنیدا ٩٢%ی چاپکراوەکانی زمانی نۆروێژی بە بووکمۆلە. نوینۆرشکا: زمانێکی نووسینە کە ئیڤار ئاسەن (١٨١٣-١٨٩٦) لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا گەشەی پێ داوە لەسەر بنەمای نۆروێژیی ڕۆژاوا و دیالێکتەکانی ناوچەکانی ناوەوە.[٢٥]
لە یۆنان: زمانانی کاتارێڤووسا و دیمۆتیکی هەن. یەکەمیان زمانێکی کۆنپارێز و مێژوویی و کەونارای یۆنانە، کە بەشێکی زۆری ئەدەبی کلاسیک و فەلسەفەی یۆنان بەو زمانە نووسراوە. ئەمڕۆ ئەو زمانە تەنیا لەناو کەسانی زمانزان و لێکۆڵەرەوە و ئەکادیمیکارەکاندا کاری پێ دەکرێت. زمانی دووەمیش زمانی قسەکردنی گەلی یۆنانە کە ٩٩،٥%ی خەڵک قسەی پێ دەکەن و زمانی ڕەسمیی وڵاتەکەیە.[٢٦]
لێرەدا زۆر گرنگە ئەوەمان لا ڕوون بێت، کە ئەو وڵاتانەی لە یەک زمانی ڕەسمی زیاتریان تێدا بە کار دەهێنرێت؛ دوو زمان، سێ زمان

[25] http://en.wikipedia.org/wiki/Ivar_Aasen.
[26] Dahl: op. cit.

یا یانزدە زمان، نەتەوە و گرۆی نەتەوەیی و ئەتنیکیی جیاواز تێیدا دەژین و ئەو زمانانەیش زمانی ئەو نەتەوە و گرۆیانەن. زمانەکانیش شێوەزمان یا دیالێکتی یەک زمان نین، بەڵکە کۆمەڵێک زمانی سەربەخۆ و جیاوازن و لەوەیە لە ڕووی مێژوویی و خێزانی زمانەوانییەوە هیچ پێوەندییەکیان بە یەکەوە نەبێت. ئەو سێ زمانەی لە بەلژیک زمانی ڕەسمین، زمانی سێ نەتەوەی جیاوازن و سەر بە دوو گرۆی زمانەوانیی جیاوازیشن. دوو زمانە ڕەسمییەکەی فینلاند، فینی و سوێدی، هیچ پێوەندییەکی مێژوویی و خێزانییان بە یەکدییەوە نییە. تەنیا لە نموونەی نۆروێژدا هەردوو زمانە ڕەسمییەکە دوو شێوەی یەک زمانن، کە ئەویش، لە لایەکەوە هۆیەکی مێژوویی هەیە وای کردووە، ناچار بن هەردوویان بە کار بێنن، لە لایەکی دیکەیشەوە شێوەی "نوینۆرشک" لە بواری فەرهەنگی و سیاسیدا نەخشێکی ئەوتۆی نییە، چونکە تەنیا ٨% (لە سەدا هەشت)ی چاپەمەنیی وڵاتەکە بەو شێوەیە دەنووسرێت و چاپ دەکرێت. هەروەها گرنگە ئەوەیش بزانین کە جیاوازیی بوکمۆل و نوینۆرشک، لە شێوەی جیاوازیی دوو دیالێکت نییە، بەڵکە زیاتر دوو شێوەی جیاوازی نووسینە. بەڕاستی نموونەی نۆروێژ نموونەیەکی ڕیزپەڕە (إستثناء- Exception) و بۆ ئەوە ناشێت وەک ڕێگەچارەی کێشەکانی زمان باس بکرێت.

## شێوە جیاوازەکانی زمان:

هەبوونی شێوەی جیاواز لە یەک زماندا، بە تایبەت لە شێوەی قسەکردندا، دیاردەیەکی تایبەتی زمانی کوردی نییە. لە هەموو زمانەکانی دنیادا، تەنانەت ئەو زمانانەیش کە بە زمانی نێونەتەوەیی و دامەزراو و پێشکەوتوو دادەنرێن، هەر وایە. زمانی ئینگلیزی، بۆ نموونە، کۆمەڵێ شێوەی جیاوازی قسەکردنی هەیە لە وڵاتانی جیاوازی وەک ئاوسترالیا، بریتانیا و ئەمەریکادا. تەنانەت لەناو ئەو وڵاتانە خۆیشیاندا کۆمەڵێ شێوەی جیاواز هەن. زمانانی گەورەی دیکەیش، سپانی، ئەڵمانی، فرانسی، هەموویان شێوەی جیاوازیان هەیە.

لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان بەزۆری کە باسی زمانێک دەکەن، مەبەستیان شێوەی ستانداردی ئەو زمانەیە، واتە زمانی ستاندارد، کە زمانی چاپەمەنییە؛ ڕۆژنامە و کتێب، زمانی دەستگاکانی ڕاگەیاندن و زمانی خوێندنە و وەک زمانی ڕەسمیی ناوچەیەک یا وڵاتێکیش قەبووڵ کراوە.[٢٧] بێجگە لەوانەیش زمانی ستاندارد ئەو شێوەیەی زمانە کە ئەگەر کەسێک بیەوێ زمانەکەمان وەک زمانی دووەم یا وەک زمانێکی بێگانە فێر ببێت، ئەو شێوەیەی زمانەکە فێر دەبێت، واتە زمانی ستاندارد فێر دەبێت. وەک دەبینین لەم ڕووەوە لایەنەکانی خوێندن و ڕاگەیاندن، هەروەهایش بەکارهێنان وەک زمانی نووسین (واتە سامانی وشە، حینجەکردن، ڕێزمان) بۆ ناساندنی زمانی ستاندارد گرنگن.

کاتێ زمانەوان لە بەشێکی زمان، لە دیالێکتێک، دەکۆڵێتەوە و دەیەوێت وردە جیاوازییەکانی نێوان شێوەکان بناسێت، ئەمە پێی دەگوترێت دیالێکتناسی (Dialectology). لە لێکۆڵینەوەیەکی وەهادا وا چاوەڕوان دەکرێت کە ئەگەر ئاخێوەرانی دیالێکتە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتردا قسە بکەن، ئەوا لە یەکتر دەگەن. بەم پێوەرە دوو دیالێکتی جیاوازی یەک زمان، لە دوو زمانی جیاواز جیا دەکەینەوە کە ئاخێوەرانی، ئەگەر یەکێکیان بە زمانی ئەوی تریان، یا بە زمانێکی دیکە کە هەردوویان بیزانن قسە نەکەن، ئەوا لە یەکتر ناگەن. دەبێ ئەوەیش بزانین کە ئەمە تاکە پێوەر و پێوەری هەرە باوەڕپێکراو نییە بۆ ناساندنی دیالێکت، بەڵام ڕەنگە یارمەتیدەر بێت بۆ چەسپاندنی ئەو بنەمایە کە هەموو دیالێکتێک، وەک هەموو زمانێک، شایانی ئەوەیە لێی بکۆڵرێتەوە و شی بکرێتەوە. هەروەها لە گۆشەنیگایەکی زمانەوانییەوە گرنگە ئەوە بزانین کە هیچ دیالێکتێک لە هیچ دیالێکتێکی دیکە "چاکتر" نییە، بەڵکە لە یەکدی جیاوازن. ئێمە ناتوانین پێوەرێکی وەها لە بواری دیالێکتناسیی کوردیدا بە کار بهێنین، چونکە دابڕانی ناوچەکانی کوردستان لە

---

27 Yule, George: The Study of Language, Third edition, Cambridge University Press, Cambridge 2007, p. 196.

یەكدی و پەیدابوونی سنووری یەكجار سەختی سیاسی لەنێوان بەشەكانی كوردستاندا و نەبوونی ڕاگەیاندنێكی هاوبەش كە بگاتە هەموو پارچەیەک (تا چەند ساڵێک لەمەوبەر)، ئەمانە هەموو هۆكارن بۆ دوورخستنەوەی ئاخێوەرانی دیالێكتەكانی زمانی كوردی و حاڵینەبوونیان لە یەكتر. جیاوازییەكانی نێوان شێوەكانی (دیالێكتەكانی) زمانی كوردی زۆر لەوە بەرینتر و قووڵترن كە بە ڕاكێشانی هێڵێكی ئیسۆگلۆس (Isogloss) لە یەک جیا بكرێنەوە. هەر زمانەوانێک ئەگەر درشتبینانە تەماشای جیاوازیی شێوە كوردییەكان بكات و لە چاوی تیۆرییەكانی زمانناسییەوە ئەو جیاوازییانە بخوێنێتەوە، لەوەیە بگاتە ئەو ئەنجامەی كە ئەمانە زمانی سەربەخۆن، نەک كۆمەڵەدیالێكتێكی یەک زمان. هەر ئەو هەڵەیەیشە وای كردووە كۆمەڵێ لە ڕۆژهەڵاتناس و كوردناسەكان سوور بن لەسەر ئەوەی كە كورد زمانێكی هاوبەشیان نییە. دیارە بەشێكی زۆری ئەو ڕۆژهەڵاتناس و كوردناسانانە لەبەر مەبەستێكی سیاسی وا بیر دەكەنەوە و ئەنجامگرییەكی وەها زەق دەكەنەوە، دەنا ئەوان بۆ شتی دیكە زۆریش وردبینن.

لەناو ئاخێوەرانی تاكە زمانێک یا تاكە دیالێكتێكیشدا دیسان جیاوازی لە شێوەی گۆكردنی وشەیەک یا فۆنیمێكدا هەیە و زمانەوانان زۆرجار ئەمە دەكەنە پێوەرێک بۆ دانانی ئەوەی پێی دەڵێن نیشاندەری كۆمەڵایەتی(Social marker)، واتە ئەو پێوەرەی كە نیشانی دەدات ئاخێوەر ئەندامی كامە گرۆ، یا كامە تاقمی كۆمەڵایەتییە، ئەگەرچی ئەمە لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێک و لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەک دەگۆڕێت. گۆكردنی دەنگی [ڕ] دوای بزوێنێک (ڤاوڵ، ڤۆكاڵ) لە شارێكی وەک نیویۆرک نیشانەی ئەوەیە كە ئاخێوەر سەر بە توێژی سەرەوەی چینی ناونجییە و هەتا بەرەو خوارتر دابەزیت گۆكردنی ئەو دەنگە كەمتر دەبێتەوە، تا لە توێژی خوارەوەی چینی كارگەردا هەر بە جارێک گۆ ناكرێت. هەر ئەو دەنگە لە شارۆچكەی (ڕیدینگ)، ٤٠ میل خۆراوای لەندەن، ڕێژەی گۆكردنی لای ئاخێوەرانی توێژی سەرەوەی چینی ناونجی سفرە، واتە گۆی ناكەن، بەڵام لای

ئاخێوەرانی توێژی ژێرەوەی چینی کرێکار ئەو ڕێژەیە دەگاتە ٤٩% (لە سەدا چلونۆ).[٢٨]

جیاوازییەکی دیکە لە بەکارهێنانی زماندا ئەو دۆخەیە کە پێی دەگوترێت دیگلۆسیا (Diglossia)، کە دوو پلەی جیاوازی بەکارهێنانی زمانێک هەبن، یەکێکی "بەرز" و یەکێکی "نزم"، یەکەمیان لە بواری ڕەسمیدا (بۆ نموونە عەرەبیی ستاندارد) و دووەمیان لە بواری نارەسمی، یا ڕۆژانە، و ناوچەییدا (بۆ نموونە عەرەبیی میسری یا لوبنانی). لە کوردیدا لەوانەیە بە هۆی تەشەنەنەکردنی زمانی ستانداردی کوردییەوە جاران نموونەی وەها ئاشکرامان لە بەردەستدا نەبووبێت، بەڵام هەر نەبێت لە سەرەتای حەفتاکانەوە جیاوازیی زمانی ستاندارد و زمانی ڕۆژانەی ناوچەیی زیاتر دەردەکەوێت. ڕەنگە نموونەی ئەم بەکارهێنانە ئەمڕۆ لە شارێکی وەک (خانەقی/خانەقین)ی کوردستانی عێراقدا بە دی بکەین. کەسێکی خوێنەوار یا کەمخوێنەواریش لە خوێندنگە و لە جێگە ڕەسمییەکاندا کوردیی ستاندارد بە کار دەهێنێت، بەڵام لە ماڵی خۆیدا و لە بازاڕ و لەگەڵ دۆستەکانی خۆیدا بە شێوەی کوردیی خانەقی قسە دەکات. هەردوو شێوەکەیش، کوردیی ستاندارد و کوردیی خانەقی، دوو بەشی یەک زمانن، کە زمانی کوردییە.

دیاردەیەکی زۆر فراوان و سروشتی لە بواری دیالێکتەکاندا ئەوەیە کە زۆر جار ئاخێوەرانی شێوەکان گاڵتە بە زمانی یەکتر، یا شێوەی قسەکردنی یەکتر، دەکەن. ئەمە دیاردەیەکە لە هەموو وڵاتانی دنیادا بە دی دەکرێت. لە کوردستانیش نموونەی زۆر هەیە لەم بوارەدا کە، بەداخەوە، هەندێ جار دەگاتە ڕادەی سووکایەتیکردن و بریندارکردنی یەکتر. ڕەنگە لێرەدا سەرنجڕاکێش ئەوە بێت کە ڕێژیمی بەعس تەنانەت دەیویست ئەم لایەنەیش بە کار ببات بۆ دروستکردنی دژایەتی و ناکۆکی لەناو شار و ناوچەکانی کوردستاندا. بەڵام تەنانەت لەناو توێژی خوێندەواری کوردیشدا ئەم دیاردەیە بە شێوەیەکی

---

[28] Yule: op. cit., p. 208.

ناشیرین هەیە و دەپارێزرێت، تا ئەو ڕادەیەی سووکایەتی بە شێوەزمان و مرۆڤی ناوچەکی دیکە بکەن. من ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە ڕاسیزمی ناوچەیی (ڕەگەزپەرستیی ناوچەیی) دادەنێم.
ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی کۆمەڵایەتییەوە تەماشای دیالێکتەکان بکەین، ڕەنگە هەندێ دیالێکت لە هەندێکی دیکە ناودارتر و شکۆدارتر بن. ڕاستییەکەی ئەو شێوەیەی زمان کە گەشە دەکات و دەبێتە زمانێکی ستاندارد، هەر پێشتر لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ناودار و شکۆدار بووە، پێبەست بووە بە ناوەندێکی سیاسی یا فەرهەنگییەوە (بۆ نموونە شاری لەندەن بۆ زمانی ئینگلیزی و شاری پاریس بۆ زمانی فرانسی).
دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی لە سەردەمی جیاوازدا هەلی ئەوەیان بۆ هەڵکەوتووە کە ببنە زمانی ناوەندیکی دەسەڵاتی سیاسی یا ناوەندێکی فەرهەنگی و دواتریش گەشە بکەن و ببنە زمانی ستاندارد. لە ئەمارەتی ئەردەڵاندا شێوەی گۆران ماوەیەکی دووروودرێژ زمانێکی ئەدەبی بوو، لە ڕووی ئەدەبییەوە دەسەڵاتی دەگەیشتە شارەزوور و گەرمیانی کوردستانی عیراقیش، بەڵام نە زمانێکی سیاسی و نە زمانی خوێندن و پەروەردە بوو. لە ئەمارەتی بۆتانیشدا شێوەی بۆتان یا جەزیرەی کرمانجی ڕۆڵێکی هەر وەهای هەبوو. هەڵوەشانەوە و لەناوچوونی هەردوو ئەمارەتی ئەردەڵان و بۆتان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، لە ڕووی مێژوویی و زمانەوانییەوە، ئەو هەل و دەرفەتەی لێ سەندنەوە کە بتوانن ببنە زمانی ستانداردی کوردی.
نموونەی شێوەی سلێمانی، وەک ناوەندێکی سیاسی و فەرهەنگی، لە زۆر ڕووەوە لە ئەزموونی هەردوو ئەمارەتی ئەردەڵان و بۆتان و هەردوو شێوەزمانی گۆران و بۆتانی جیاوازە. بە پەیدابوونی ئەمارەتی بابان و دەسەڵاتی سیاسیی ئەو ئەمارەتە، شێوەزمانێک بوو بە زمانی ئەدەبی کە هەر لە سەرەتاوە تێکەڵییەک بوو لە شێوەکانی بابان و شارەزوور و قەرەداغ و کەرکووک. دەرفەتێکی زۆر گرنگی مێژوویی و کاریگەر لە نەخشی ئەم شێوەیەدا ئەوە بوو کە بە

ڕووخان و هەڵوەشانەوەی ئەمارەتی بابان، کارکردی زمانە ئەدەبییەکە ڕانەوەستا، بەڵکە هەر زوو دەستەڵاتێکی دیکەی سیاسیی کورد لەو ناوچەیەدا پەیدا بوو و ئەو بۆشاییەی نەمانی دەستەڵاتی بابانی پڕ کردەوە؛ دەستەڵاتی حوکوومەتی کوردستانی باشوور بە سەرکردایەتیی شێخ مەحموودی حەفید. لەو کاتەیش بە دواوە زمانی کوردی دەرفەتێکی یەکجار گەورەتری دەست کەوت، کە بوو بە زمانی دەستەڵاتی سیاسیی حوکوومەتەکەی شێخ مەحموود و کە بوو بە زمانی دەستگای ڕاگەیاندن و چاپەمەنی و ئەوجا بوو بە زمانی خوێندنیش. تەنانەت بە هەڵوەشانەوەی دەستەڵاتی سیاسیی حوکوومەتی شێخ مەحموودیش ڕۆڵی زمانی کوردی کزتر نەبوو، بەڵکە پلەیەکی بەرزتری وەرگرت و بنەڕەتێکی پتەوتری بۆ دروست بوو، کاتێ بەپێی دەستووری دەوڵەتی تازەدامەزراوی عیراق زمانی کوردی ڕێگەی پێ درا لە بواری خوێندن و چاپەمەنی و ڕاگەیاندندا بە کار ببرێت. بە درێژاییی سەردەمی پاشایەتی لە عیراقدا پلە و پایەی زمانی کوردی هیچ کاتێک دانەلەنگا و بەرەو لێژی نەڕۆیشت، بەڵکە زیاتریش پێش کەوت، بەتایبەت کاتێک بەشی کوردی لە وەستگەی ڕادیۆی بەغدا دامەزرا و بەوەیش ڕۆڵی زمانەکە وەک زمانی ڕاگەیاندن بەهێزتریش بوو و تەنانەت کاری دەکردە سەر بەشەکانی دیکەی کوردستانیش. لە سەردەمی ڕێژیمی کۆماریدا زمانی کوردی بە ڕێگای ستانداردبووندا پلەیەکی دیکەیش پێش کەوت کاتێ لە زانستگەی بەغدا بەشی زمانی کوردی کرایەوە و بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنی کوردی دامەزرا و لە دواساڵەکانی شەستەکاندا کۆمەڵێ دەستگای زانستی و فەرهەنگی بۆ پێشخستن و پاراستنی زمان و فەرهەنگی کوردی دامەزران و پەخشی تەلەڤیزیۆنیش بە زمانی کوردی دەستی پێ کرد. ڕەنگە ڕەشترین ماوەی زمان و فەرهەنگی کوردی لە سەردەمی تازەدا ساڵانی ١٩٦٣-١٩٦٦ بووبێت.[٢٩]

پێوەندیی سیاسی و فەرهەنگیی نێوان هەردوو بەشی کوردستانی ئێران و کوردستانی عیراقیش، چ لە سەردەمی کۆماری دیمۆکراتی

---

[29] Shakely, Farhad: Den moderna kurdiska novellen, Licentiatavhandling i iranska språk, Uppsala universitet, 2001, s. 30.

کوردستان لە مەهابادا و چ سالانی شۆڕشی چەکدارانەی کوردستانی عیراق و چ سالانی ڕێکەوتننامەی ١٩٧٠-١٩٧٤ و دواتریش کە کۆماری ئیسلامیی ئێران دامەزرا، ئەمانە هەموو هۆکار بوون بۆ دەوڵەمەندبوونی زمانی ستانداردی کوردی. ناوچەی جیۆگرافی و کەوشەنی کارکرد و بەکارهێنانی ئەو زمانە کوردستانی عیراقی تێپەڕاند و بەشی هەرە زۆری کوردستانی ئێرانیشی گرتەوە.

## پ: کێ دەبێ بەشدار بێت؟

گوتوبێژکرن لەبارەی مەسەلەیەکی ئاڵۆز و قووڵی وەک زمانی ستاندارد و زمانی ڕەسمی و ئەلفوبێوە، بابەتێکی هونەری و تەکنیکی و کارناسانەیە، بەو مەعنایەی کە کەسانێک دەتوانن بەشداریی تێدا بکەن، کە بەڕاستی لەو زانستانەدا شارەزا بن و ئەوەندە ئەزموون و زانیاری و خوێندەوارییان هەبێت کە لایەنە جیاوازەکانی باسەکە تێبگەن و بتوانن لە شارەزایی و زانستەوە قسەی تێدا بکەن. بۆ نموونە ئەگەر دەبێ باس لە دەرهێنانی نەوت لە ناوچەیەکی کوردستاندا بکرێت، ئەوانەی دەتوانن و دەبێت بەشداری لە گوتوبێژی ئەو بابەتەدا بکەن، پێویستە شارەزای گێۆلۆگی و تەکنیک و بڕێکیش کیمیا بن. ئەگەر باس لە ئابووری و سیستەمی بانک و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ وڵاتاندا کرا، ئەوا ئابووریناسان و سەرمایەداران و ڕەنگە هەندێک سیاسەتمەداریش بتوانن بەشدار ببن.

لە گوتوبێژی زمانی کوردیدا کێ دەتوانێت و دەبێت بەشداری بکات؟ ئایا هەر خوێنەوارێکی کورد، هەر لەبەر ئەوەی کوردە و خوێنەوارە، دەتوانێت بەشداری بکات؟ بێگومان نا. ئایا هەر ئەکادیمیکارێکی کورد مافی بەشداربوونی هەیە؟ دیسان نا. دیارە بواری بابەتەکە زۆر سنووردارە و تەنیا جێگەی باوەڕ و بۆچوونێکی وای تێدا دەبێتەوە کە لەسەر بنەمای زانست هەڵچنرانێت. ئێمە کە لە نزیکەوە سەرنجی گوتوبێژ و نووسینەکان لەمەڕ کێشەی ئەمڕۆی زمانی کوردی بدەین، دەبینین هیچ سنوورێک و هیچ بەرپرسیارییەکی زانستی و هیچ خۆسانسۆرکردنێک لە ئارادا نییە. دەبینین خوێنەوار و کۆلکەخوێنەوار

و نەخوێنەواریش بەشداری دەکەن، زانا و نەزانیش هاوبەشن، لێزان و لێنەزان، ئەزموودار و بێئەزموون، هەر هەموو خۆیان هەڵدەقورتێننە ناو باسێکەوە کە دەبوو خۆیان لە ئاستیدا بە غەریب و بێگانە دابنایە. ئەنجامی ئەم ئاڵۆزی و ئاژاوەیە ئەوەیە کە لە جێی ئەوەی گوتوبێژێکی زانستی و پڕ و دەوڵەمەند دروست ببووایە، ئەمڕۆ باس و موناقەشەکان لە پلەیەکی زۆر نزم و نازانستیدان و زۆریش لە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی بابەتەکەوە دوورن. گەلێک لەوانەی کە زۆریش چالاکانە بوونەتە بەشێک لەم مەسەلەیە لە سەنگەری ناوچەگەری و خێڵایەتی و دەمارگرژییەکی تەسکبین و فەناتیکەوە هێرش دەبەن و هیچی تر.

من نایەم لێرەدا ئامۆژگاریی ئەخلاقی و سیاسیی کۆنپارێزانە ببەشمەوە، بەڵام بە لامەوە گرنگە ئەو پێوەرانە، ئەو کریتێریا و ستانداردانە دەستنیشان بکەم کە لە بابەتێکی وەهادا ناکرێ پشتگوێ بخرێن و بە ناپێویست و نەبوو دابنرێن. ئێمە ڕووبەڕووی کێشەیەک دەبینەوە کە کێشەی زمانە، زمانی کوردی. بنەڕەتی کێشەکەیش پێوەندیی بە ستانداردبوون، ڕەسمیبون، سنوورەکانی نێوان زمان و دیالێکت، ئەلفوبێ و ڕێنووسەوە هەیە. کاتێ ئەم بنەمایانەمان لا ڕوون بن، ئەودەم دەبێ ئەوەیشمان لا ڕوون بێت کە بۆ ئەوەی کەسێک بتوانێت بەشدارییەکی لێزانانە و زانستییانە و بەرهەمبەخش بکات، دەبێ: یەک: زمانەوان، یا زماننناس (Linguist) بێت؛ دوو: دەبێ کوردیزان بێت.

ئێمە ئەگەر بە شێوەیەکی میکانیکی ئەم دوو مەرجە دابنێین و بسەپێنین و وا چاوەڕوان بین کە لەناو کورددا خەڵکانێکی زۆرمان هەن ئەو مەرجانەیان تێدان، دیارە خۆمان تووشی هەڵەیەکی گەورە دەکەین. لەبەر ئەوە ناچارین ئەو پێوەرانە بە شێوەیەک بگونجێنین کە لەگەڵ پێویستی و گرنگیی باسەکە و لەگەڵ ئەو توانست و ئەزموون و سەرچاوانەدا کە هەن، تەبا بێت. شارەزایی لە هەر زانستێکدا دەتوانێت لە پلەی جیاوازدا بێت. بیرکردنەوەی ڕاست ئەوەیە داوای پلەیەکی شارەزایی و ئەزموونداری بکەین، بەڵام نایشتوانین باسەکە هێندە

بەئاسانی وەربگرین کە هەر کەسێک کوردیی زانی و ناوی زمانناسیی بیستبوو، ئیتر دەرگای لێ بکرێتەوە.
ڕەنگە پێناسەکردنی زمانناس یا زمانەوان، لەناو کورددا، ئاسانتر بێت لە پێناسەکردنی کوردیزان. لەم سەردەمەدا کە زمان و فەرهەنگی کوردی تووشی قەیرانێکی قووڵ و دژوار هاتووە، بە هەزاران کەس هەن کە هەر لەبەر ئەوەی بە کوردی دەنووسن، خۆیان بە کوردیزان و تەنانەت زمانەوانیش دادەنێن. ئەمە دیاردەیەکە، هێندەی نیشانەی ئاژاوە و نەخۆشییە، نیو هێندە نیشانەی پێشکەوتن و خوێندەواری نییە.
ئەگەر زمانناسی و کوردیزانی دوو مەرجی بنەڕەتی بن، پێم وایە کۆمەڵێ مەرجی دیکەیش هەن قورسایی و بایەخیان، بۆ ئەم بابەتە، لەو دووە کەمتر نییە، بۆ نموونە: شارەزایی لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا، بەتایبەت دوو شێوەی کوردیی باکوور و کوردیی باشوور، شارەزایی لە زمانی دیکەدا، بەتایبەت زمانەکانی هاوسێی کورد، عەرەبی و فارسی و تورکی؛ شارەزایی لە ئێتیمۆلۆگیدا (زانستی ڕەگوڕیشەی وشەکانی زمان، لێرەدا مەبەست زمانی کوردییە)؛ زانینی زمانێکی گەورە و پێشکەوتووی جیهانی (ئینگلیزی، فرانسی، ئاڵمانی)؛ شارەزایی لە ئێرانناسیدا، بەتایبەت زمانە کۆن و تازەکانی ئێران.
کاتێ نووسەرێک خۆی تێکەڵ بە گوتوبێژی زمان و زمانەوانی دەکات، ئێمە ئەو چاوەڕوانییەمان هەیە کە دەبێ پێش هەموو شتێک توانستی ئەوەی هەبێ کەرەستە زمانەوانییەکەی خۆی بە جۆرێک پێش خستبێت، کە باوەڕ بکەین ئەم کەسە بە جۆرێکی بەرپرسانە تەماشای زمان دەکات. دەبێ بەڵگە و بەڵگەکارییەکانی ئەوەمان لا بچەسپێنن کە وەک شارەزایەک دەنووسێت و دەزانێت باسی چی دەکات. لە بوارێکی ورد و پڕدیسیپلینی وەک زماندا ئێمە ناتوانین چاوپۆشی لە هەڵەی ڕێزمان و ڕێنووس بکەین، کە دەزانین ئەو هەڵەکردنە ئەنجامی نەزانین و وردنەبوونەوەیە. نووسەرێکی کورد کە وەک شارەزایەکی زمانناس و کوردیزان خۆی ڕادەنێت و لە بوارەکەدا ئامۆژگاری و تیۆری پێشکەش دەکات، تەنیا لە یەک وتاردا کۆمەڵێ هەڵە دەکات،

هەموو بەڵگەی ئەوەن کە زانیارییە تیۆرییەکانی ئەوەندە کۆمەکیان پێ نەکردووە کە کوردینووسینەکەی خۆی سانسۆر بکات. لێرەدا چەند نموونەیەکی ئەو هەڵانە دەهێنمەوە: (دادەندرێ، ببوو، بۆ وەی، دەیهەوێ، لە کوردی دا، جیاوازی گەورە).
ئێمە ناتوانین ڕێگە لە کەس بگرین کە تۆ نابێ لەم بابەتەدا بەشداری بکەیت و بنووسیت. ئەم دیاردەیە خۆی بەشێکە لە پلەی شارستانەتی و لە ڕادەی پێشکەوتنی فەرهەنگ لە وڵاتێکدا و لەناو کۆمەڵێکدا. لەو وڵاتانەدا کە ژیانی فەرهەنگی دامەزراو و پێشکەوتووە، دوو شێوەی سانسۆر هەن کە ڕێگە لە پەیدابوونی ئاژاوە دەگرن: یەکەم: خۆسانسۆر، کە نووسەر و ڕووناکبیر خۆی خۆی سانسۆر دەکات و دەزانێت چی دەنووسێت و بواری نووسینی ئەو چییە. ئەم خۆسانسۆرکردنە هەم بابەت و بواری شارەزایی دەگرێتەوە و هەم کەرەستە زمانەوانی و زانیارییەکانیش؛ دووەم: ڕۆژنامە و گۆڤار و دەستگاکانی ڕاگەیاندن هەمیشە ئەو بەرزویستییەیان لایە کە ئەوەی پێشکەشی بینەر و خوێنەری دەکەن، دەبێ لە پلەیەکی بەرز و چاک و دەوڵەمەنددا بێت، لەبەر ئەوەیش هەمیشە هەوڵ دەدەن کەسانی زانا و شارەزا و کارناس و لێزان ڕووبەڕووی بابەتە گەرم و گرنگەکان بکەنەوە و بیاندوێنن و داوای نووسین و بۆچوونیان لێ بکەن. ئەمەی لێرەدا باسی دەکەم پێوەندییەکی نییە بە لایەنە خراپ و دزێوەکانی دەستگاکانی ڕاگەیاندنەوە، بەتایبەت لە ڕۆژاوا. ئەوە بابەتێکی دیکەیە و دەکرێ بە جیا باس بکرێت. لە کوردستاندا نووسەر و ڕووناکبیری کورد زۆر لەوەوە دوورن کە خۆیان خۆیان سانسۆر بکەن و ڕاگەیاندنیش زۆر لەوەوە دوورە کە بەرزویستییەکی وای لا دروست بووبێت، بەرپرسانە لە دروستکردنی شارستانەتی و فەرهەنگدا بەشدارییەکی جیددی بکات.

## تێ: دوو زمانی ستاندارد یا دوو دیالێکتی یەک زمان؟

لە یەکەم سەرنجدا وا پێ دەچێت هەر وا بە ئاسانی بتوانین زمان و دیالێکت لە یەک جیا بکەینەوە و پێناسەیان بۆ دابنێین، بەڵام بەڕاستی ئەمە یەکێکە لە بابەتە ئاڵۆز و چارەنەکراوەکانی زمانەوانی. زۆربەی زمانناسان لەیەکگەیشتن دەکەنە پێوەرێک بۆ بڕیاردانی ئەوەی کە دوو شێوەزمان بە دوو دیالێکتی زمانێک دابنێن، یا بە دوو زمانی جیاواز. پێوەری وەها بەرانبەر نموونەی زۆری زمان و ناوچە و ولاتانی دنیا هەر زوو هەرەس دەهێنێت و ناڕاستبوونی دەردەکەوێت. لە ناوچەی "دالارنا"ی سوید شێوەقسەکردنێک هەیە پێی دەڵێن "ئێلڤدالی"، واتە شێوەی یا زمانی ئێلڤدال. بۆ سوێدییەک کە زمانی ستانداردی سوێدی بزانێت، زۆر زۆر ئاسانترە لە زمانی نۆروێژی یا دانی (زمانی دانمارک) حاڵی ببێت، تا ئەو شێوەیەی کە بە ڕەسمی بە دیالێکتێکی سوێدی دادەنرێت. ئەگەر بۆ نموونە بگەڕێین، سەدانی وەها لە ولاتانی جیاوازی دنیادا دەدۆزینەوە.
"زمان"، واتە زمانی ستاندارد، زۆرجار بەوە پێناسە دەکرێت کە بەپێی ئەو نەخشەی هەیەتی دەناسرێتەوە، واتە خوێندن و پەروەردە، فەرهەنگ، دەستەڵاتی سیاسی، پلەی کۆمەڵایەتی...هتد، ئەودەم "دیالێکتەکان"، ئەگەر زۆریش بە خۆشەویستییەوە باس بکرێن، وەک هەندێ پاشماوەی جوانکیلە و ئێسکسووک ناو دەبرێن، بەڵام ئەگەر زمانێکی تۆزێ زبر بە کار ببرێت، ئەودەم وەک کۆسپ و ڕێگر لە بەردەم گەشەکردن و پێشکەوتندا باس دەکرێن. بەم پێیە بێت زمان تەنیا ئەوەیە کە زمانی نووسینە، ئەمەیش کاتێ ڕاستە کە پلەیەکی ڕەسمیی هەبێت، یا هەر نەبێ پلەیەکی ددانپێدانراوی هەبێت. لەوە بترازێ ئەوی دیکە هەمووی دیالێکتە. کەواتە پێوەرەکانی پێناسەکردنی زمان پێوەری زمانەوانی نین، بەڵکە باس لەوە دەکەن زمان چ

نەخشێکی لە کۆمەڵدا هەیە، واتە پێوەرەکان لە دەرەوەی هەرێمی زمانەوانییەوە هێنراون، پێوەری نازمانەوانین.[30]

وەک دەبینین پێوەری ناساندنی زمان تا ڕادەیەکی زۆر پێوەری دەرەوەی زمانەوانین، پێوەری سیاسین. ئەنجامی ناساندنێکی وەهایش ئەنجامێکی سیاسییە، چونکە، وەک ئۆیستەن دال دەڵێت، ئەگەر "ئێلڤدالی" بە زمانێکی سەربەخۆ دابنرێت، نەک دیالێکتێکی زمانی سوێدی، کەواتە دەبێ منداڵانی ئێلڤدال، مافی ئەوەیان هەبێت بە زمانی خۆیشیان بخوێنن، نەک بە زمانی سوێدی، چونکە ئەودەم ئەوانیش وەک کەمایەتییەکی ناو سوێد دادەنرێن. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە منداڵانی ئێلڤدال بە زمانی سوێدی دەخوێنن.

نەک هەر لە بواری زمانەوانیدا، بەڵکە لە زۆر بواری دیکەی سیاسی و کۆمەڵایەتییشدا، ناکرێ بە شێوەیەکی میکانیکی کۆمەڵەپێوەرێکی زانستێک وەربگرین و بیسەپێنین بەسەر زمان و کۆمەڵگای خۆماندا. ئێمە دەزانین کە ساڵانێکی دوورودرێژ زۆر کەسی سیاسەتمەدار و زانای کۆمەڵناسی و مێژووناسی و زانستی دیکەیش کوردیان بە نەتەوە دانەدەنا. ئێستایش لەناو ئەکادیمیکارانی ئەوروپادا کەسانی وا هەن، ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، دەڵێن کورد یەک نەتەوە نییە، چونکە بەپێی پێوەرە وشک و بێگیانەکانیان کورد ئەو مەرجانەی نەتەوەبوونی تێدا نییە. بەڵام بەرانبەر بەوانەیش زانستکار و ئەکادیمیکاری دیکە هەن کە دەزانن دەبێ پێوەرەکان بە جۆرێکی دیکە بخوێنرێنەوە و بە کار ببرێن. لەناو خوێنەوار و ڕووناکبیر و سیاسەتمەدارانی کورددا کەسانێک هەبوون و هەن کە دژی ئەو بۆچوونانە ڕاوەستاون. نە تیۆری و پێوەرەکانی ئەو بەناو زانستکارانەی ئەوروپا کوردی لە نەتەوەبوون خستووە و نە بەرگریی ڕووناکبیر و سیاسەتمەداری کوردیش، کوردی کردووە بە نەتەوە. لە زمانیشدا هەر وایە. ساڵەهای ساڵە ئەو تیۆرییانە هەن و بڵاو دەبنەوە، داگیرکارانی کوردستانیش هەمیشە گومانیان خستووەتە سەر زمان، مێژوو، فەرهەنگ و بوونی

---

[30] Dahl, Östen: Språkets enhet och mångfald, Studentlitteratur, 2007, s. 80.

کورد خۆیشی. بەڵام لە ئەنجامدا مرۆڤی هۆشیاری کورد، بە هەر دیالێکت و بە هەر شێوەیەکیش قسەی کردبێت، خۆی بە کورد زانیوە و ئەو زمانەی کە قسەی پێ کردووە بە شێوەیەکی زمانی کوردی داناوە.

لە کوردستاندا کۆمەڵێک دیالێکت و بەشەدیالێکت و شێوەی ناوچەیی هەن کە بە تەنیشت یەکەوە ژیاون و گەشەیان کردووە و ڕۆڵیان هەبووە لە پاراستنی فەرهەنگ و بیر و کەسایەتیی ئەوانەدا کە قسەیان پێ کردوون. بە هۆی کۆمەڵێ هۆکاری سیاسی و ناسیاسییەوە سێ دیالێکتی زمانی کوردی وای بۆ هەڵکەوتووە کە ماوەیەک وەک زمانێکی ئەدەبی لە ناوچەیەکی دیاریکراودا بە کار ببرێن. لەم سێ دیالێکتە تەنیا یەکێکیان پرۆسێسی گەشەکردن و پێشکەوتنەکەی بێ ناوبڕ بەردەوام بوو، تا ئەو ڕادەیەی بوو بە زمانێکی ستاندارد، ئەویش دیالێکتی کوردیی ناوەندی، یا کوردیی خواروووە. من دەمەوێ ئەوە جەخت بکەم کە نەخشی دوو دیالێکتەکەی دیکە نەخشی زمانێکی ئەدەبی بوو، واتە زمانی شیعر و پەخشان، بەڵام زمانی زانست و سیاسەت و ڕاگەیاندن نەبوون.

دیالێکتی کرمانجیی باکوور، یا کوردیی سەروو، دوای دابڕانێکی زۆر، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا جارێکی دیکە خراوەتەوە کار و بۆ نووسین بە کار هاتووە. هاوکات لەگەڵ ئەو بەکارهاتنەدا گۆڕان و گەشەکردنێک لە کرمانجیدا ڕووی داوە کە کارێکی زۆر قووڵ و چارەنووسسازی کردە سەری؛ گۆڕینی ئەلفوبێ. لە کاتێکدا کوردیی خواروو لە ماوەی نزیکەی دووسەدوپەنجا ساڵی ڕابوردوودا هەر بە یەک ئەلفوبێ نووسراوە و قۆناغ لە دوای قۆناغیش چاکسازی و ڕیفۆرم لە ئەلفوبێ و ڕێنووسەکەیدا کراوە، تا ئەو ڕادەیەی کە ئێستا لەناو ئەو زمانانەدا کە ئەلفوبێکانیان لەسەر بنەمای ئەلفوبێی عەرەبی هەڵچنیوە، زمانی کوردی خاوەنی پێشکەوتووترین سیستەمی نووسینە، بەو مەعنایەی کە توانیویەتی لەجێی ئەو سەروبۆرەی زۆربەی زمانەکانی دیکە لە نووسیندا بە کاری دەبەن، زمانی کوردی بەرانبەر بە بزوێنەکان (ڤاوڵ، ڤۆکال) تیپ و نیشانەی تایبەتی داناوە.

کرمانجی کە جاران هەر بەو ئەلفوبێ کوردییە نووسراوە کە بۆ نووسینی دیالێکتەکانی گۆران و کوردیی خواروو بە کار هاتووە، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە بوو بە زمانێک کە بە سێ ئەلفوبێی جیاواز دەنووسرێت؛ کوردەکانی سۆڤییێت، بەپێی سیاسەتی ستالین بۆ دابڕینی گەلانی ناو سنووری سۆڤییێت لە هاوزمان و هاوڕەگەزەکانی دەراوسێ، ئەلفوبێیەکی کریلیکی تایبەتیان بۆ خۆیان دروست کرد و تا سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردوو بە شێوەیەکی چالاکانە بە کاریان دەهێنا. کوردی تورکیا ئەلفوبێی کوردییان لە بیر برایەوە و فێری زمانی تورکی و ئەلفوبێی تورکی کران و پێوەندییەکیان بە زمانی نووسراوی کوردییەوە نەما. لەو سەروبەندەدا جەلادەت بەدرخانیش ئەلفوبێیەکی لاتینیی لەسەر بنەمای ئەلفوبێی تورکی دروست کرد و لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا بڵاوی کردەوە و هەندێ لە شاگردەکانی دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی نووسراوی کوردیی کرمانجی بە ئەلفوبیی لاتینی. نووسەرانی بادینانی کوردستانی عیراق هەر لەسەر بەکارهێنانی ئەلفوبێی کوردی مانەوە و ئەو گۆڕان و ڕیفۆرمەی زمانەوانانی کوردیی خواروو ئەنجامیان دا، ئەوانیش سوودیان لێ وەرگرت و دەستیان کردە بەکارهێنانی.

لە ئەنجامی ئەم گەشەکردن و گۆڕانانەدا کوردیی باکوور، کرمانجی، نەک تەنیا ئەلفوبێکەی گۆڕا، بەڵکە وەک زمانێکی ئەدەبی، کە لە سنوورێکی تەسکدا بە کار هاتووە، لە ڕووی گەنجینەی وشە و ڕێزمانیشەوە گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات. گۆڕانی ڕێزمان لە کرمانجیدا زۆر لەوە قووڵترە کە وەک هەندێ جیاوازیی بچکۆلە تەماشای بکەین. ئەم گۆڕانە دۆخەکانی ناو (Case, Kasus)، سیستەمی کردار و سینتاکسیش دەگرێتەوە. ئێستا کە باسی کرمانجی وەک زمانێکی ئەدەبی دەکەین، لە ڕاستیدا باسی سێ شێوەی جیاواز دەکەین، کە بەتەواوی لە یەکدی دور کەوتوونەتەوە: شێوەی کوردیی سۆڤییێتی جاران، شێوەی کرمانجیی بۆتانی (شێوەی جەزیرە) کە بەشێکی زۆری نووسەرانی کوردی تورکیا بە کاری دەبەن و شێوەی

بادینانی. هیچ کام لەم سێ شێوەیەی کرمانجی، لەبەر کۆمەڵێ هۆی سیاسی، بۆی نەلواوە وەک زمانێکی ستاندارد ڕۆڵ ببینێت.

نەخشەی زمانی کوردی ئەمڕۆ دەکرێ وا باس بکرێت کە لە چەند دیالێکتێک پێک هاتووە، کە لە ڕووی پێشکەوتن و ستانداردبوون و بەکارهێنانەوە لە پلە و ئاستی جیاوازدان. لەناو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا، کرمانجیی باکوور و کرمانجیی باشوور (کوردیی سەروو و کوردیی خواروو یا ناوەند) لەوانی دیکە زیاتر بە کار دەبرێن و گەشەیان کردووە. کوردیی خواروو تاکە شێوەی زمانی کوردییە کە دەتوانین وەک زمانێکی ستاندارد پێناسەی بکەین، چونکە لە مێژوودا گەلێ جار و ئێستایش، بووەتە زمانی خوێندن و پەروەردە، زمانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، زمانی چاپەمەنی و زمانی ڕاگەیاندن و، لە بواری زانستیی جۆراوجۆردا پێی دەنووسرێت. کوردیی سەروو، کرمانجی، هەرگیز ئەو هەلومەرجەی بۆ هەڵنەکەوتووە کە ڕۆڵی زمانێکی ستاندارد ببینێت. یەکێ لە کێشە قووڵ و جیددییەکانی کرمانجی ئەوەیە کە سێ شێوەی جیاوازی بە تەنیشت یەکەوە گەشەیان کردووە. هەروەها لەماوەی نزیکەی ٤٠-٥٠ ساڵدا کرمانجی بە سێ ئەلفوبێی جیاواز نووسراوە و ئەمڕۆ بە دوو ئەلفوبێ دەنووسرێت.

لەناو هەموو بەشەکانی کوردستاندا ئەمڕۆ تەنیا کوردستانی عیراقە کە دەرفەتی ئەوەی تێدا هەیە زمانی کوردی ئازادانە بە کار ببرێت و ڕۆڵی زمانێکی ستاندارد ببینێت. لە ماوەی نزیکەی سەد ساڵی ڕابوردوودا ئەم بەشەی کوردستان هەمیشە، کەموزۆر، هەلومەرج و دەرفەتێکی وەهای هەبووە و هەر ئەوەیشە کە بووەتە هۆی پێشکەوتن و گەشەکردن و بەستانداردبوونی کوردیی خواروو. دەبێ ئەو ڕاستییە بزانرێت کە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و دروستبوونی دەوڵەتە تازەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوەی زمانی کوردی و فەرهەنگی کورد و شارستانەتیی کورد و ڕابوردووی کوردی پاراست، کوردستانی عیراق و شێوەزمانی کوردیی خواروو بوو. لە کوردستانی

ئێرانیشدا ساڵانی ١٩٤٠-١٩٤٦ جۆرێک ئازادی و پێشکەوتنێک بە دەست هات، کە بەداخەوە هەر زوو لەناو برا. لە بەشەکانی دیکەی کوردستاندا زمان و فەرهەنگی کورد قەدەغە بووە. ئەم ئەزموونە مێژوویی و دەوڵەمەندەی کوردستانی خواروو (کوردستانی عیراق) لە هەموو لایەکەوە بە دەیان هێزی دوژمن و ناحەز و نەیار گەمارۆ دراوە و هەر هەموویشیان یەک ئامانجیان هەیە؛ ئەویش هەڵوەشاندنەوە و ڕووخاندن و لەناوبردنی ئەو ئەزموونەیە. دوو کۆڵەکەی هەرە پتەو و گەورەی مانەوەی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عیراقدا، هەستی نەتەوایەتیی کوردی، واتە هۆشی خۆ بەکوردزانین و خۆ بەنەتەوەزانین، و زمانی کوردییە. ئەم دوو بنەڕەتە لە ماوەی ٥٠-٦٠ ساڵی ڕابوردوودا بە ڕادەیەکی یەکجار فراوان پتەوتر بوون و سیمای پێگەیشتن و ستانداردبوونیان تێدا دەرکەوت. هیچ سەیر نییە کە ئەو هێزە نەیارانەی دژی ئەزموونی کوردستانی عیراق کار دەکەن، بە وریایی و هۆشیارییەوە لە پێش هەموو شتێکدا هەوڵ دەدەن ئەو دوو کۆڵەکەیە و ئەو دوو بنەڕەتە هەڵوەشێننەوە و بڕووخێنن. ئەم بەربەرەکانێ و دوژمنایەتییە بە شێوەی پارچەپارچەکردن و گومان دروستکردن و درز تێخستن و لە یەکدی دوورخستنەوەی چین و توێژ و ناوچە و دین و مەزهەبە جیاوازەکانی کوردستان خۆی دەربڕیوە.

لەم چەند ساڵەی ڕابوردوودا کە بووژانەوە و گەشەکردنێکی فەرهەنگیی فراوان سەرتاسەری کوردستانی عیراقی گرتووەتەوە و تا ڕادەیەکی باشیش کاری کردووەتە سەر بەشەکانی دیکەی کوردستان، هەڵمەتێکی زۆر ناڕەوا و گوماناوی دەستی پێ کردووە بۆ سووککردن و بچووککردنەوەی زمانی ستانداردی کوردی و گومانکردن لە هەموو ئەو سامان و گەنجینە دەوڵەمەندەی بەرهەمی مێژوویەکە کە نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر دەستی پێ کردووە تا گەیشتووەتە ئەمڕۆ. ئەم هەڵمەتە لە کۆمەڵێ داخوازیی ناڕەوا و بیری نازانستی پێکهاتووە، وەک:

<> زمانی ستانداردی کوردی زمانی ناوچەیەکی بچووکە، زمانی ناوچەی سلێمانییە،
<> کوردیی خوارووی زمانێکە ئینگلیز دروستی کردووە،
<> ناوبردنی کوردیی خواروو بە شێوەی سۆرانی،
<> زۆربەی خەڵکی کوردستان بە کرمانجی دەدوێن، کەواتە دەبێ کرمانجی ببێتە زمانی ڕەسمیی هەموو کورد،
<> کوردی زمانێکی جووتستانداردە و دەبێ کوردستان دوو زمانی ڕەسمیی هەبێت،
<> دەبێ لە کوردستاندا هەموو دیالێکتەکان بە کار ببرێن و هەر ناوچەیەک بە زمان و شێوەزمانی ناوچەکەی خۆی بخوێنێت و کاری ڕەسمی بە ڕێوە ببات،
<> ئەو ئەلفوبێیەی کە بۆ نووسینی کوردیی خواروو بە کار دەبرێت ئەلفوبێی عەرەبییە،
<> لەبەر ئەوەی هەموو وڵاتانی پێشکەوتووی دنیا ئەلفوبێی لاتینی بە کار دەبەن، دەبێ کوردیش ئەلفوبێی خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی وەک ئەوان پێش بکەوێت،
<> ئەلفوبێی عەرەبی لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا ناگونجێت، بەڵام لاتینی باشتر دەنگەکانی زمانی کوردی دەردەبڕێت،
<> دەبێ ئەلفوبێی لاتینی بە کار ببەین بۆ ئەوەی خۆمان لە عەرەب و ئیسلام ڕزگار بکەین.

ئەو داخوازی و بیر و بۆچوونانە سەرلەبەریان لەسەر بنەمای فریودان و چاوبەست و شاردنەوەی ڕاستی و بەرزکردنەوەی زڕەبەڵگە و زڕەزانست هەڵچنراون. بە وردبوونەوەیەکی ئاسایی تێدەگەین کە هەر هەموویان بەشێکن لەو هێرشە نارەوایەی دەکرێتە سەر ئەزموونی کوردستانی خواروو و ئامانجەکەیشی، وەک پێشتریش باسم کرد، هەڵوەشاندنەوەی دوو کۆڵەکەی پتەوی نەتەوایەتی و زمانی ستانداردە. بەڕاستی من لە نووسین و دیدارەکانمدا بە دوورودرێژی لەسەر ئەم بابەتانە قسەم کردووە و بە

پێویستی نازانم لێرەدا ئەو زانیاری و بەڵگەکارییانە سەرلەنوێ دووبارە بکەمەوە.
داخوازییەکی زۆر ناڕەوای وەک بەکارهێنانی هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی وەک زمانی خوێندن و زمانی ڕەسمی لە ژێر پەردەی دیمۆکراسی و ئازادیی هەڵبژاردندا، نیشانەیەکی ڕوونە کە هەڵگرانی ئەو بیرانە چۆن بۆ هەڵخەڵەتاندنی مرۆڤی کورد پەنا دەبەنە بەر دروشمی ڕەنگاوڕەنگی فریودەرانە، لە کاتێکدا زۆربەی زۆریان نە پاشخانی سیاسییان و نە بیری هەلپەرستانەی ئەمڕۆیان لەگەڵ دیمۆکراسی و ئازادیخوازیدا ناگونجێت. لە باسی بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی تورکییشدا هەر هەمان تاکتیکی چاوبەستانە بە کار دەبەن. پاساودانی وازهێنان لە ئەلفوبێی کوردی و بەکارهێنانی لاتینی بەوەی کە ئەو ئەلفوبێیە دەبێتە هۆی پێشکەوتنی کورد، چونکە هەموو دنیای پێشکەوتوو ئەلفوبێی لاتینی بە کار دەهێنێت، بەتەواوی دژی مەنتیقی ئاوەز و زانستە. ئەگەر بەکارهێنانی لاتینی دەرگایەک بێ بۆ تێکەڵبوون بە دنیای پیشەسازی و تەکنیک و زانستی پێشکەوتوو، دەبوو بەشێکی زۆری گەلان و زمانان و وڵاتانی دنیا (چین، تایلاند، کۆریا، یۆنان، ئیسرائیل، ئەتیووپیا، جاپان، ئەریتیریا، عەرەب، ئێران، ئەرمەنی، بەنگلادێش، پاکستان، هندستان، گورجستان...هتد) لە نەتەوە هەرە دواکەوتووەکانی دنیا ببوونایە، کە دەزانین وا نین، چونکە ئەمانە هیچیان ئەلفوبێی لاتینی بە کار ناهێنن، بەڵکە بە شانازییەوە دەستیان گرتووە بە فەرهەنگ و زمان و شارستانەتی و ناسنامەی خۆیانەوە، کە بێگومان ئەلفوبێ کۆڵەکەیەکی گرنگی ئەو شارستانەتی و ناسنامانەیە. هەندێک لەو نەتەوانە، لە ڕووی تەکنیک و زانستەوە ئەوەندە پێشکەوتوون کە شان لە شانی ئەوروپا و ئەمەریکا دەدەن. ئەگەر بەکارهێنانی لاتینی چارەسەری دواکەتنی گەلان ببوایە، چۆنە وا لەناو هەموو ئەو گەل و نەتەوە و وڵاتانەدا، کە ژمارەیان لە سێ میلیارد زیاترە، دوو پیاوی ژیر و عاقڵ هەڵنەکەوتن بزانن بە هۆی ئەلفوبێی لاتینییەوە دەتوانن خۆیان لەو پاشکەوتنە ڕزگار بکەن، بەڵام

تەنیا کوردە گوندی و بێسەوادەکەی ئێمە ئەوەندە عاقڵ بوو ئەم نهێنە قووڵ وگەورەیە بدۆزێتەوە؟
لە لایەکی دیکەیشەوە ئەگەر ئەلفوبێی لاتینی ئەو دەرمانە کارییە و ئەو هەتوانە یەزدانییەیە کە هەموو دەردێک چارە دەکات، خۆ زمانی وەک سواحیلی و سۆمالی (دوو زمانی ئەفریقایین) بەو ئەلفوبێیە دەنووسن، بەڵام نە بوون بە ئەورووپایی و نە پێش کەوتن و نە لە دەردەکانیان ڕزگاریان بوو.

ئەوانەی بە ناوی دیمۆکراسییەکی درۆزنانەوە و بە ناوی مافی مرۆڤانەوە داوا دەکەن هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی وەک یەک دەرفەتیان بدرێتێ و ببنە زمانی ڕەسمی لە کوردستاندا، دەبوو بتوانن وەرامی ئەم دوو پرسیارە بدەنەوە:
ئەلف: ئایا هیچ دیالێکتێکی کوردی، لە کوردیی خواروو بەولاوە، دەتوانێت ئەرکی زمانێکی ستاندارد و زمانێکی ڕەسمی هەڵبگرێت؟ کە دەڵێم زمانی ستاندارد و زمانی ڕەسمی مەبەستم ئەوەیە ئەوەندە دەوڵەمەند و پێشکەوتوو بێت و ئەوەندە دامەزراو بێت کە بکرێ زانستی جۆربەجۆری پێ بنووسرێت و بخوێنرێت، کاروباری دەوڵەتی لە بوارە جیاوازەکانی کارگێڕیدا پێ بە ڕێوە ببرێت و توانستی ئەوەی هەبێت بەردەوام خۆی لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنیکی و زانستییەکانی دنیای ئەمڕۆدا بگونجێنێت، خۆی نوێ بکاتەوە و خۆی دەوڵەمەند بکات.
بێ: دەبێ چ میکانیزمێک بە کار ببەین، ئەگەر ئامانجمان ئەوە بێت لە دوارۆژدا، با ئەو دوارۆژە دووریش بێت، کورد ببنە خاوەنی یەک زمانی یەکگرتوو و یەک زمانی ڕەسمی؟ ئەوان لە کاتێکدا داوای ئەوە دەکەن کە هەر ناوچەیەکی کوردستان بە شێوەزمانی خۆی بخوێنێت، باسی ئەوەیش دەکەن، دیارە بۆ چاوبەست و فریودان، کە لە ئەنجامی گەشەکردنی ئەم شێوەزمانانەدا دواتر زمانێکی یەکگرتوو دروست بکرێت، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە ئەوە ڕوون بکەنەوە نەخشەی گەیشتن بەو ئامانجە چۆنە و کامەیە؟ ئایا ئەگەر دیالێکتەکان بوون بە

زمانی ڕاگەیاندن و زمانی خوێندن لەو ناوچانەدا کە قسەیان پێ دەکرێت، لە ماوەی چەند ساڵێکدا نابن بە زمانی سەربەخۆ؟ ئەی ئەودەم چۆن دەتوانین کۆمەڵە زمانێک لە یەک نزیک بکەینەوە و یەک زمانی ستانداردیان لێ دروست بکەین؟
دیارە وەرامدانەوەیەکی ڕاستگۆیانەی ئەو پرسیارانە نیازی ڕووخێنەرانە و نازانستانەی خاوەنی ئەو بیرانە ڕیسوا دەکات و ئەوەیش ئاشکرا دەکات کە ئامانجی ئەوان تەنیا شێواندنی باری زمانەوانی و فەرهەنگی و سیاسیی کوردستانە، نەک چارەسەری کێشەکان.

## جیم: چارەسەر

زۆر گرنگە لە کاتی گوتوبێژدا لەسەر کێشەی زمان ئەوەمان لە بیر بێت کە ئێمە باسی کوردستانی خواروو، کوردستانی عیراق، دەکەین، نەک هەموو کوردستان، چونکە کوردستانی خواروو تاکە بەشێکی کوردستانە کە نیوچە سەربەخۆیی و ئازادییەکی هەیە و دەتوانێت لە بواری خوێندن و زمان و فەرهەنگدا پلان بۆ ئێستا و دوارۆژی خۆیشی دابنێت. ئەم هەلە دەگمەنەی ئێستا لە کوردستانی خوارووداهەڵکەوتووە، شتێک نییە کە بە ئاسانی بە لایدا ڕاببوورین و لە بەکارهێنانیدا کەمتەرخەمی بنوێنین. مەسەلەیەکی گرنگ و ژیانیی وەک زمانی ڕەسمی، هیی ئەوە نییە کە بۆ ڕێککەوت و بۆ دوارۆژێکی نادیاری بە جێ بهێڵین، بەڵکە دەبێ هەرچی زووتر چارەسەری بۆ دابنرێت و بخرێتە کارەوە.
لەم دووڕییانە گرنگ و ناسک و خەتەرناکەی مێژووی نەتەوەی کورد و نیشتمانەکەیدا ئەرکێکی یەکجار گەورە و مێژوویی دەکەوێتە ئەستۆی بڕیاردەرانی کوردستانی عیراق. ئەوان ئەگەر بیانەوێ کەسایەتیی سیاسییان لە ئاستی ئەو بەرپرسایەتییە مێژوویی و نەتەوایەتییەی بەوان سپێردراوە دانەلەنگێ، دەبێ بە بڕوایەکی تەواوەوە، بە بێ هیچ جۆرە دوودڵییەک بڕیار بدەن و خۆیان بکەنە خاوەنی ئەو بڕیارەی کە دڵنیام دەبێتە گەورەترین و تەمەندرێژترین

بڕیار و دەستکەوت لە سەرتاسەری مێژووی کورددا. دەبێ بڕیار بدەن کە زمانی کوردیی ناوەڕاست، کە ساڵانێکە ڕۆڵی زمانی ستاندارد دەبینێت، بەو ئەلفوبێیەوە کە لە ماوەی هەزار ساڵدا گەشەی کردووە، بکرێ بە زمانی ڕەسمیی هەرێمی کوردستان، واتە لە سەرتاسەری هەرێمی کوردستانی عیراقدا ببێتە زمانی کارگێڕیی حوکوومەت، زمانی خوێندن و پەروەردە لە هەموو پلەکاندا و زمانی دەستگا ڕەسمی و گشتییەکانی ڕاگەیاندن. ئەو زمانە ستاندارد و ڕەسمییە دەکرێت و دەبێت بە گەنجینەی وشە و دەربڕینی دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەوڵەمەند بکرێت.

بەڕەسمیبوونی کوردیی خواروو وەک زمانێکی ستاندارد و ڕەسمی هەرگیز مەعنای ئەوە نییە دیالێکتەکانی دیکەی کوردی قەدەغە دەکرێن یا کەنار دەخرێن، بەڵکە دەبێ یارمەتیی ئەو دیالێکتانە بدرێت کە گەشە بکەن و دەوڵەمەند بکرێن و لە بواری ڕاگەیاندنی ناوچەییدا بە کار ببرێن. هەروەها دەبێ سامانی فۆلکلۆر و ئەدەبی کلاسیک و ئەدەبی مۆدێرن بەو دیالێکتانە پشتگری بکرێت و بکرێتە بابەتی توێژینەوەی زانستی.

زمانی ستانداردی کوردی شێوەزمانی هیچ ناوچەیەکی تایبەتی کوردستان نییە، بەڵکە بەرهەمی گەشەکردن و دەوڵەمەندبوونێکە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی زاراوەکاندا پێک هاتووە. زمانی ستانداردی کوردی لە کاتێکدا شیلەی هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردییە و ئەنجامگریی بەرهەمی فکری و هۆشیاریی نەتەوەیە، مەرج نییە بە جۆرێک بێت هەموو ئاخێوەرانی دیالێکتە جۆراوجۆرەکانی زمانەکە لە قسەکردنی ڕۆژانەدا بە کاری ببەن، یا تەنانەت بە تەواوی تێی بگەن، ئەگەر بەو زمانە ستانداردە خوێنەوارییان نەبێت. زمانی عەرەبیی ستاندارد وشەی زۆربەی دیالێکتەکانی گرتۆتە خۆی، بەڵام ئاخێوەرانی هیچ دیالێکتێکی عەرەبی ئەو زمانە ستانداردە لە قسەکردندا بە کار ناهێنن، تەنانەت خەڵکی تیرەی قورەیش خۆیشیان، واتە ناوچەی مەککە و مەدینەی وڵاتی حیجاز، کە زمانەکە لەوێوە پەیدا بووە، ئەوانیش، ئەمڕۆ، بەو زمانە ستانداردە قسە ناکەن.

لەناو دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا تەنیا کوردیی ناوەڕاستە کە ڕێک بە پرۆسێسێکی وەهادا ڕۆیشتووە. ئەم زمانە ستانداردە کە ڕەنگە لە سەرەتاوە لە ناوچەی سلێمانی و شارەزوورەوە بناخەکەی دامەزرابێت، بەڵام هەر زوو بە هۆی شاعیرانی گەورەی وەک نالی (شارەزوور) و حاجی قادری کۆیی (کۆیە) و وەفایی (سابڵاخ) و شێخ ڕەزای تاڵەبانی (کەرکووک) و دواتریش سەدان نووسەر و شاعیر و ڕووناکبیری دیالێکتە جیاوازەکانەوە بە جۆرێ دەوڵەمەند بووە، بووەتە گەنجینەیەک کە پێوەندیی لەگەڵ دیالێکتە سەرچاوەکانی خۆیدا (سلێمانی و شارەزوور) تا ڕادەیەکی زۆر کز بووە و چەندان هەنگاویش لە دیالێکتەکانی دیکە نزیک بووەتەوە، بێ ئەوەی بەتەواوی لە هیچ یەکێکیان بچێت. ئەنجامێکی زۆر سروشتی ئەوەیە کە هەموو کوردێکی خوێنەوار لەو زمانە ستانداردە تێ بگات و پێی بخوێنێتەوە و بنووسێت، بێ ئەوەی ناچار بێت لە ژیانی ڕۆژانەیدا، لەناو خێزانەکەی خۆی، گەڕەکەکەی خۆی، یا شارەکەی خۆیدا بەو زمانە ڕەسمی و ستانداردە قسە بکات. هیچ دیالێکتیکی دیکەی زمانی کوردی بەم پرۆسێسەدا تێنەپەڕیوە و نەیتوانیوە بەشە دیالێکتەکانی دیکە لەناو خۆیدا جێ بکاتەوە و هەزم (هەرس)یان بکات و بیانکاتە بەشێک لە دەوڵەمەندیی خۆی.

# هەندێ لەو سەرچاوانەی لەم نووسینەدا سوودیان لێ وەرگیراوە:


Markus-Evangelium (Mukri Kurdisch), انجيل مرقوس، Druckerei Awetaranian philippopel, 1909.

الخالدي المقدسي، الشيخ يوسف ضياءالدين پاشا: الهدية الحميدية في اللغة الكردية، سعادت مطبعەسی، ١٣١٠ [١٣١١ هـ ،١٨٩٤ م].

Dahl, Östen: Språkets enhet och mångfald, Studentlitteratur, 2007.

Yule, George: The Study of Language, Third edition, Cambridge University Press, Cambridge 2007.

Milroy, James and Lesley: Authority in language, Investigating language prescription and standardisation, Routledge, London 1991.

Ferguson, Charles A. : Sociolinguistic perspectives; Papers on Language in Society, 1959-1994, Oxford Studies In Sociolinguistics, Oxford University Press 1996.